# جیاوازی نێوان
# ئیسلام و دیموكراسی

ئامادەكردنی: م.ڕێبین عومەر

چاپی یەكەم

٢٠١٤ز ١٤٣٥ك

## ناسنامەی نامیلکە:


- ناوی پەڕتووک: جیاوازی نێوان ئیسلام و دیموکراسی
- ئامادەکردنی:م.ڕێبین عومەر
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- شوێنی چاپ: چاپخانەی سیما
- نۆرەی چاپ: یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤ز، ١٤٣٥ك
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٣٠٨)ی ساڵی ٢٠١٤ز پێ بەخشراوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## پێشکەشە بە:

- گیانی پاکی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) و یار و شوێنکەوتوانی.
- بەو موسڵمانەی جگە لە حوکمی ئیسلامی هیچ حوکمێکی تری پێ قبوڵ نییە.
- بەو موسڵمانەی هەوڵدەدات بۆ بەدەستهێنانی نیعمەتی بەرچاو ڕۆشنی (جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست).
- بەو موسڵمانەی هەرگیز نا ئومێدی بەرچاوی تاریک ناکات و هەمیشە ئومێدەوارە بە گەڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامی.
- بەو موسڵمانەی هەر هەنگاوێکی بەرەو ڕووی ئامانجێکی مەزنی دیاریکراوە هەڵدێنێت.
- بەو موسڵمانەی خاوەن ویژدانێکی زیندووە بەرامبەر بە مرۆڤەکان.

# بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

❖ { أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ}[المائدة:٥٠]، واتە: "ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلییەت و نەفامییان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە".

❖ {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ} [المائدة:٤٤]، واتە: "ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن".

❖ "دیموکراسی وەکو بتە لە خورما دروستکراوەکانی قورەیش وایە، قورەیش هەتا ئیشیان بە بتە لە خورما دروستکراوەکان بوو دەیانپەرست کە بێ خواردنیش دەکەوتن دەیان خوارد، ڕۆژئاواش هەتا ئیشیان بە دیموکراسی بێت قبوڵی دەکەن کە ئیشیان پێی نەما فەرامۆشی دەکەن و ئینقیلابی بە سەردا دەکەن". {شەهید حەسەن بەننا}

❖ "ئێوە خەلافەتی ئیسلامی لە دڵتاندا دابمەزرێن، وە لە کردەوەتاندا بە ڕەنگبداتەوە خۆی لەسەر زەویدا دادەمەزرێتەوە". {شەهید سەید قوتب}

## "پێشەکی"

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وصحابته أجمعين.

نوسینی بابەتی (جیاوازی نیوان ئیسلام و دیموکراسی) لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارانەیە لە نێوان ئاینی پیرۆزی ئیسلام و یەکێک لەو فکرە دروستکراوانەی کە مروڤەکان بۆ خۆیان دروستیان کردوە کەبریتییە لە:دیموکراسی.

گرنگی ئەم بابەتە لەوەدا دەبینین؛ چونکە بابەتێکی زیندووە بۆ ئەم سەردەمە لەبەرئەوەی دیموکراسی یان ئەو فکرانەی کە مرۆڤەکان بۆ خۆیان دروستیان کردووە بۆتە گەورەترین فیتنەو بەلا کە داوێنی موسوڵمانانی ئەم رۆژگارەمانی گرتوە هەروەک پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت:"لينقضن عرى الاسلام عروة عروة، فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها، وأولهن نقضا للحكم وآخرهن الصلاة". راستی فەرمووە سەرورمان:"پایەکانی ئیسلام دانە دانە دەروخێن هەردانیەک دەروخێ خەڵکی پەنا بۆ دانەیەکی تر دەبەن یەکەم دانەکە دەروخێت دەسەلاتە و کۆتادانە نوێژکردنە" ئێستاش هەرچی جوەکان و گاورەکان ئەنجامی دەدەن موسوڵمانان شوێن هەنگاوەکانیان دەکەون بەبێ ئەوەی لێی بکۆڵنەوە تاچەند لەگەڵ ئیسلام یەکدەگرێتەوە، هەر لەم رێگایەوە رۆژئاوا زۆربەی ولاتانی

موسوڵمانی خستۆتە ژێر ركێفی خۆی، وە چاوبەستانە نەتەوەكانی چەوساوەی ئەم وڵاتانەی هۆگر و ئەوینداری خۆی كردوە. رۆژئاوا بەم فێڵ و تەڵەكانە پێی خستۆتە سەرملی موسوڵمانان و تەواوی پاشەكەوتەكانی ماددی و مەعنەوی بەتاڵان بردووە و لەبەرامبەردا بیروبۆچونی فاسد و بەسەرچوی بە خەڵات بۆ هێناوین.

هەروەها هۆكاری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە ئەوەیە تا بتوانم ئەوە رون بكەینەوە ئەوەی كە ئیسلام لەئاینەكانی تر جیادەكاتەوە ئەوەیە كەهیچ جیاوازیەكی نەكردوە لەنێوان دین و دنیادا یان لە نێوان دین و دەوڵەتدا خوای گەورە دەفەرموێت ((ربنا آتينا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة)) بۆیە زانایانی ئیسلام مەیدانی سیاسەتیان بۆ تەنها رۆژێك بەجێنەهێشتوە، بەڵكو سەرمەشقی ئەو مەیدانەبوون.

دوای لێكۆڵینەوەیەكی ورد گەشتینە ئەوڕایەی كە دیموكراسی لەدورونزیك هیچ پەیوەندییەكی بە ئیسلامەوە نییە بەڵكو زۆر جیاوازە و پێچەوانەی یەكترن، بەڵام بەداخەوە زۆرێك لە بەناو رۆشنبیر و بیرمەندەكانمان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە دیموكراسی پیادەبكرێت، وەك چارەسەر بۆكێشەكانی ئەم سەردەمە، چەندین بەڵگە بۆ ئەوە دێننەوە، لەوەی كەدەستەواژەیەكی تازە دێننە پێشەوە "دیموكراسی ئیسلام".

بەڵام ئیسلام چارەسەرە بۆ هەموکێشـەکانی مرۆڤـایەتی لەرابـردو و ئێستا و داهاتوودا لە هەمولایەنەکانەوە "لەلایەنی سیاسی نـاوخۆیی و دەرەکـیەوە و ئـابوری وکـۆمەڵایەتی و رۆشـنبیری و مرۆیـی وئەخلاقی .....هتد"چارەسەری ئیسلامی پشت بە پـاکی مرۆڤەکـان دەبەسـتێت و سەرخسـتنی خـوایی لەگەڵـدایە هەمیشـە تواناودەسـەڵاتی خـودایی سـەرکەوتنی مسـۆگەرە، بەڵام تـادڵ و دەروون و تێگەیشتن و لێبـران و دڵسـوزی ونیازپـاکی موسـوڵمانان لەگەڵ خـوادا راسـت نەبـنەوە و بـۆی یەکلانەبـنەوە، ئەوکـۆمەک وسەرکەوتنە بەدی نایەت.

بـۆیە پێویسـتە لەسـەر موسـوڵمانان خۆیـان بەدوور بگـرن لە رێچکەکـان یا تروسـکاییەکی بـاش یـان رۆشـنی تیـاببینن؛ چـونکە ئیسـلام خـۆی شـارێی هیـدایەت و بەرزی و پێشـکەوتنە و هەمـوو باشـیەکان و رۆشـناییەکانە، خـوای گەورە دەفەرموێـت (( وإن هـذا سراطـی مسـتقیما فـاتبعوه ولاتتبعـوا السـبل فتفـرق بـکم عـن سـبیله))واتە:ئەمەی لەبەردەستاندایەرێگای راسـت ودروسـتی خـوایە شوێنی بکەون بەشوێن رێچکەبچوکەکانی تردا مەڕۆن؛ چونکە شوێن کەوتنی ئەو ڕێیە بچووکانە دورتان دەخاتەوە لەرێی راست و رێگای خوای گەورە".

(ان الدین عند الله الاسلام ) و (ومن یبتغی غیرالاسلام دینافلن یقبل منه)

# "جیاوازی نێوان ئیسلام و دیموکراسی"

له نێــوان سیســـتەمی ئیســـلامیی و سیســـتەمی دیموکراســـی دا جیاوازییەکی مەزن هەیە لە بنچینە و بناغە و بەشەکانیاندا. ئەگەر چـی هەنـدێک لێکچـوون هەیە لە بەشـە بچوکەکانیانـدا بەڵام ئەمە نابێتە پاسا و بۆ ئاوێتە کردنییان؛ چـونکە دیموکراسـی "کـوفرە" و ئیسلامیش "ئیمانە". وە دەشزانین کە دەوڵەتـی ئیسـلامی بەردەوام سیستەمی ئیسلامی جێ بەجێ کردووە بۆ ماوەی زیـاتر لە سـیازدە (١٣) سەدە، وە وشەی دیموکراسی یان هاوماناکانی دیموکراسیشی بەکـار نەهێنـاوە. بەڵام لەگەڵ نەبـوونی ڕژێمـی ئیسـلامی، خەڵکـی لەسەر پەیڕەوی ڕژێمێکی دیموکراسـی دەڕۆن کە ئەم ڕژێـمە خـۆیی لە بەدیلی ڕژێـمە سـتەمکار و زۆردار و جاسوسـییە سـەربازییەکاندا دەبینێـــتەوە کە ئەمەش شـــتێکی سروشـــتییە خەڵکـــی ڕژێمـــی دیموکراسی بەباشتر دابنـێن لە بەرامـبەر ڕژێمـی زۆرداری سـەربازی دا، وە بێگومانیش ئەمـانە هەموویـان ڕژێمـی کـوفر و بـێ بـاوەڕین. ئاگـاداربە، ئـێمە کاتێـک ڕژێمـی دیموکراسـی قەبـوڵ نـاکەین مانـای ئەوە نییە کە ڕژێمی زۆرداری سەربازی و ستەم کاریمان پـێ قەبوڵـە و هەڵیدەبژێرین، نەخێر، بەڵکو ئیسـلام هەڵـدەبژێرێن کە ڕەحـمەتە بۆ جیهانییان و لە لایەن خودای بەخشندەی میهرەبانەوە ڕێساکانی دانراوە.

بەڵام لەم بەشـەدا خەڵکـی توشـی لـێ تێکچوونێکی ئاشـکرا بـوون بەوەی کە ئیسلام دەڵێت هەڵبژاردنی خەلیفە: بە ڕێگەی هەڵبژاردن و پەیمان دانە. وە دیموکراسیش دەڵێت: هەڵبژاردنی فەرمـانڕەوا بە ڕێگەی هەڵبژاردن و پەیمان دانە، یاخود نـوێنەرانی گەل لە ڕێـگەی سـندوقەکانی هەڵبـژاردنەوە هەڵـدەبژێردرێن کە ئەمەش لە دیموکراسـی و ئیسـلامدا هاوشـێوەی یەکتـرن،{لە ڕۆژگـاری ئەمـڕۆدا شـوێنکەوتووانی فکـرەی دیموکراسـی زۆر شـانازی بە مەسـەلەی هەڵبـژاردنەوە دەکەن، بەڵام ئـێمە وا بـۆ هەزار و چوارسـەد سـاڵە شـانازی بە هەڵبژاردنـی خەلـیفەوە دەکەیـن، بـاش بـزانە! یەکەم هەڵبژاردن لەسەر شێوازی هەڵبژاردنی بـاوی ئەم سـەردەمە، وە بـۆ یەکەمجار لە هەڵبژاردنێکـی کە هەردوو ڕەگەز نێـر و مـێ بەشـداری تێـدا بـکەن لە پێنـاو هەڵبژاردنـی "خەلـیفە"...، لە هەڵبژاردنـی هەردوو هاوەڵـی بەڕێز حەزرەتـی "عوسـمان و عەلـی" دا بـوو ... کە لەلایەن ئەنـدامی شـورای ئەو سـەردەمە هـاوەڵی بەڕێـز "عەبدولرەحمانی کوری عەوف"ەوە سەرپەرشتی دەکرا}.

یاخود لە ئیسلامدا ئومەت لێ پرسینەوە لە فەرمانڕەوا دەکات، وە لە دیموکراسیشـدا بەهەمـان چەشـنە. هەربـۆیە وایـان لـێ دێـت بە کورت بینی خۆیان وا دابنێن کە دیموکراسی لە ئیسلامدا هەیە یـان ئیسلام واتە: دیموکراسی. هەربـۆیە لێـرەدا هەوڵـدەدەین بە کـورتی

جیاوازی هەردوو ڕژێمەکە بخەینە ڕوو تا نمایان و ئاشکرا بێت کە جیاوازیی ڕژێمی ئیسلامی و دیموکراسی لە چیدایە؟:-

## ١ لەڕووی بنچینەوە:-

دیموکراسی بریتییە لە: وشەیەکی ڕۆژئاوایی، وە یان بە زاراوەی ڕۆژئاوا پێی دەوترێت: ( فەرمانڕەوایی گەل بۆ گەل، وە بە یاسای گەل). وە دیموکراسی ڕژێمێکی فەرمانڕەواییە کە بەرهەمەی دەستی مرۆڤە و مرۆڤ دایناوە کە لە بیروباوەڕی جیاکردنەوەی ئایین لە ژیان (عەلمانیەت) سەرچاوە دەگرێت، ئەویش لە پێناو دەرباز بوون لە ستەمی فەرمانڕەواکان و دەست بەسەرداگرتنی پیاوانی کەنیسە، وە فەرمانڕەوای کردنی خەڵکی بە ناوی ئایینەوە بۆیە دەڵێن : ببەخشە ئەوەی بۆ پادشایە بۆ پادشایە، وە ئەوەی بۆ خودایە بۆ خودا. دیموکراسی ڕژێمێکە کە سەرچاوەکەی مرۆڤە، وە پەیوەندی بە ئایین و سروش (وحی)ەوە نییە.

هەرلەبەر ئەمەیە ڕاست نییە کە پێناسەی دیموکراسی وەها بکرێت کە تەنها شێوازێک یان هۆکارێکە و پەیوەندی بە بیروباوەڕو فکرەوە نییە و هاوشێوەی سیستەمی هاتوچۆ و سیستەمی بەڕێوەبردنە؛ چونکە دیموکراسی لە نیگای واقیعەوە ڕژێمێکە کە لە

بیروباوەڕی جیاکردنەوەی ئایین لە ژیان هەڵهێنجراوە، وە هەندێک لە بیرمەندانی ڕۆژئاوا، دیموکراسی دەگەیەننە پلەی تێڕوانین بۆ ژیان. بەڵام ئیسلام: بریتییە لەو ئایینەی کە خودا ناردویەتیە خوار بۆ محمد (د.خ) لە پێناو ڕێکخستنی پەیوەندی مرۆڤ بە ئافرێنەرەکەیەوە (خودای میهرەبان)، وە بە نەفسی خۆیەوەو بە دەوروبەرەکەیەوە بە هاوئاهەنگی لەگەڵ مرۆڤەکاندا. یان پەیوەندی مرۆڤ بە خودا و بیروباوەڕ و بەندایەتییەکانییەوە، وە پەیوەندی مرۆڤ بە نەفسی خۆیی و ڕەوشت و خواردن و خواردنەوە و پۆشینەوە دەگرێتەوە، وە پەیوەندی مرۆڤ بە دەوروبەرییەوە و هەڵس و کەوت و سزاکان دەگرێتەوە، ئیسلام بنەمایە بۆ هەموو ژیان. وە ڕژێمی ئیسلامی سەرچاوەکەی زاتی ئیلاهییە نەک مرۆڤی دروستکراوی دەستی زاتی ئیلاهی، وە لەسەر بیروباوەڕی ئیسلام دروست دەبێت کە ئایین جودا ناکاتەوە لە دەوڵەت و ژیان.

{ ئێمە وەکو موسڵمان کە باوەڕمان بە دیموکراسی نییە، وە بە حوکمی فەرمانڕەواییەکەشی لەبەر ئەوەی دەست نووسی مرۆڤە، با وا نەزانین تەنها ئێمە بەم جۆرە بیردەکەینەوە، بەڵکو بیرمەندە ژیر و ویژدان زیندووەکان دەمێکە پەییان بە حەقیقەتی گرنگی پەیامێکی ئاسمان بردووە تا ببێتە ڕەحمەتێک بۆ مرۆڤەکان سا بەڵکو ژیانی خۆیانی بە شادییەوە لەگەڵدا بگوزەرێنن، ئەوەتا

پسپۆری یاسای نێودەوڵەتی "جۆرج وایت کریس باتۆن" دەڵێت: "هەرگیز، ناتوانیت بگەیتە سیغەیەکی یاسایی کە مرۆڤەکان ببات بەرێوە لە کاتێکدا ئەم یاسایە مرۆڤ دایبنابێت، تەنها پێوەرێک کە هەمووومان لەسەری کۆکبین و زوڵمی لە مرۆڤی تێدا نەکرێت ئەو پێوەرەیە کە "ئەگەر هاتوو پەیامێکی ئاسمانی هەبێت"، وە ئەو پەیامە ئاسمانییەش هەموو مرۆڤەکان وەکو یەک بخوێنێتەوە، وە هەمووشمان تیادا خاوەنی ماف و ئەرک دەبین و کەسمان تییادا ستەملێکراو نابین، لەبەر ئەوە ئەمە باشترین یاسایە کە مرۆڤ بتوانێت جێ بە جێی بکات.

وە دەمێکە ئاقڵە ویژدان زیندووەکان پەییان بە پوچی و کورت ڕۆیی دەستوری دیموکراسی بردووە کە دەست نووسی مرۆڤ بێت، هەروەک "جاک مارتین" دەڵێت: " لەهەر کۆمەڵگایەکدا بڕیار بوو بڕیار بدرێتە دەستی مرۆڤ، وە مرۆڤ دەستور دابنێت ئەو کات ئەگەر قەزیەیەک پێش هات مرۆڤەکان بۆ خۆیان دەبن بە تەرەفێک لە قەزییەکە و بۆ خۆشیان دەبن بە قازی".

هەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام خاوەنی یەکەم دەستوورە لە جیهاندا کە لە ساڵی "٦٢٣"زاینیدا نوسراوە، ڕۆژهەلاتناسی ڕۆمانی "جیورجو" دەڵێت: ئەم دەستورە لە "٥٢' بەند پێکهاتبوو، "٢٥" بەندی تایبەت بە موسڵمانان بوو، "٢٧" بەندیش تایبەت بە

پەیوەندی موسڵمانان بە ئاییەنەکانی تـر کە تیایـدا رێـز لە هەمـوو ئایینەکان گیراوە و رێگایان پێدراوە مومارەسەی ئـایینەکەی خۆیان بکەن}.

## ٢ بیر و فـەرمان و یاسـاکـان:-

دیموکراسـی گرنگـی نـادات بەو سـەرچاوەی کە پێویسـتە بیری (فکـــر) لـــێ وەربگیرێـــت کە پەیوەســـتە بە بیـــرو باوەڕەوە (عقیـدە) وە، وە ئەو بیـرو بۆچونـانەی کە پەیوەسـتن بە شارستانییەت یـان پەیوەسـتن بە فەرمـان کـردن و بە یاسـاکانەوە. بۆیە دیموکراسی کە دانراوی دەستی مرۆڤەکانە سەروەری تیایدا بـۆ گەلە، وە گەل یاسـاکان دادەنێـت، وە گەل دەسـەڵاتی یاسـادانانی هەیە بە بـێ خـودا. لەبەرئەوە دیموکراسـی ڕژێمـی کـوفرە؛ چـونکە فەرمانڕەوای لە سەرەتادا دەبەخشێتە دەستی مرۆڤ، وە دەسەڵاتی یاسادانان دەبەخشێتە مـرۆڤ نەک خـودای دروسـتکاری مـرۆڤ، وە یاسـادانان بە مـافی خـودا بە تەنهـا دانانێـت بە بـێ هـاوەڵ! بەڵام ئیسـلام پێویسـتی کـردووە لەسـەر شـوێن کەوتـوانی ئەوەی کە لە موحەمەدەوە (د.خ) هاتووە وەریبگرن وەک سـەرچاوە بـۆ بیروبـاوەڕ و شارســـتانییەت و فەرمـــانە شـــەرعی و یاســـاییەکانیان، هەروەک

**خودای مەزن دەفەرموویت:** { وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ (الحشر :٧) }، یان { وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ} (المائدة :٤٩) ،یان ( أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا) (النساء :٦٠).

(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا) (النساء :٦٥).

**وە پێغەمبەری خودا (د.خ) دەفەرموێت:** (كل عمل ليس عليه أمرنا فهو رد)، **بناغەی ڕژێمی ئیسلام بریتییە لە سروش (وحی)ی ئیلاهی ، وە مافی یاسادانانی تەنها بە خودا داوە، وە سروش تاکە سەرچاوەیە بۆ یاساکان. لەبەرئەوە وەرگرتنی بیری ڕۆژئاوا و بیروباوەڕی سەرمایەداری یان شارستانیەت و تێڕوانین و یاساکانی قەدەغە (حەرام) کردووە .**

٣ **بەختەوەری**:- بەختەوەری لای ئەهلی دیموکراسیخواز و شارستانییەتی ڕۆژئاوا بریتییە لە: بەدەست هێنانی زۆرترین بڕی ئارەزوبازی و وەرگرتنی چێژ لە ژیانی دونیا، بەڵام بەختەوەری لای ئەهلی ئیسلام و شارستانییەتی ئیسلامی بریتییە لە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی زاتی ئیلاهی باڵادەست. { دەروونزان فرۆید یەکێک لە باوەڕەکانی ئەوەیە کە مرۆڤ تەنها بۆ تێرکردنی ئارەزووکانی دروست بووە، بەڵام ئیسلام ڕێزێکی پتری لە مرۆڤ ناوە بەوەی کە خودای دەیەوێت مرۆڤی ڕێزلێنراو جودا بکاتەوە لە ئاژەڵ؛ چوونکە ئاژەڵ زیندەوەرێکە هەمیشە خەریکی تێرکردنی ئارەزووەکانییەتی، بەڵام ئیسلام دەڵێت: پێویستە مرۆڤ خەریکی تێرکردنی لایەنی ڕۆحی و فکری بێت تا ژیانێکی ئارام و سەربەرزانە بۆ خۆی و دەوروبەرەکەی فەراهەم بهێنێت، وە فکری دیموکراسی فکرێکی مادديگەراییە، بەڵام فکرەی ئیسلامی مرۆڤ زۆر لە ماددە بە نرختر دەزانێت ئەویش بە هۆکاری ئەوەی کە خودا ڕێزی لە مرۆڤ ناوە بە ڕۆح، خۆ ئەگەر ڕێزی مرۆڤ بە ماددە بێت ئیدی مرۆڤ لە قور دروستکراوێکی سادەە هیچی تر نییە. وە یەکێک لە نوسەرە ڕۆژئاواییەکان دیل کارنگی کە پەرتووکەکانی بە ملیۆنان دانەی لێ

دەفرۆشرێت، ئەو خەڵکی فێری وانەکانی بەختەوەری دەکرد کەچی بەدەستی خۆی خۆی کوشت.

ئێمە کە حوکمی ئیسلامیمان دەوێت با وا نەزانین تەنها خۆمان دان بە ڕاستییەتی ئەو شەرعیەتەدا دەنێین کە داوای دەکەین، نەخێر، بەڵکو زۆرێک لە ئارەزومەندانی ویژدان زیندوو دەمێکە لە حەقیقەتی خراپی خۆ ڕووتکردنەوە گەیشتوون، هەربۆیە تازە بە تازە داوای نەهێشتن و سنور دارکردنی خۆ ڕووتکردنەوەی ئافرەتان دەکەن.

سەیر بکەن بەڕاستی شارستانییەتی ڕۆژئاوا هەزار ساڵ زیاتریش ماوە بگاتەوە بە مەزنی شەرعیەتی ئیسلام، ئەواتا لە ئیتاڵیا لە شاری "کاستێلا ماری دی ستابیا"، لەم شارەدا هەمیشە ئاژاوەگێڕی و پێداکێشانی سەیارە ڕوویدادە، ئەوەبوو بیرلسکۆنی داوای لە پارێزگاری شار کرد کە مەسموحبە هەر کارێک دەیکەیت بیکە بەس چارەیەک بۆ بارودۆخی نا هەمووواری ئەم شارە بدۆزەرەوە، سەرۆکی شارەوانییەکەش پێی گووت: هەموو کێشەکان کە لەم شارەدا ڕوودەدات بە هۆی ئەو تەنوورە کورتانەوەیە کە ئافرەتان لەبەری دەکەن، کابرایەک بە سەیارە بە ڕێگادا دەڕوات ئافرەتێک دەبینێت ڕووتە ئیدی ئاگای لە لێخوڕینەکەی نامێنێت، ئەوەبوو

یاسایەککیان دەرکرد بە ناوی نا بۆ ئەو جلانەی کە زۆر ڕووتـن، وە هەر ئافرەتێک ئەم جلانە لەبەر بکات ٦٩٠ دۆلار غرامە دەکرێت.

دواجار ئاشکرابوو کـە ئەو پیـاوەی ڕێکخـراوی (فـیمن) بـەڕێوەدەبات کــە دروشــمیان (ئــەرکمان نــاڕەزایــی دەربڕینــە و چــەکمان سـنگەڕووتەکەمانە)ە ، بـەڵام دەرکـەوت ئـەو پیـاوە ئـارەزووی بـۆ خانمەکان بووەو بۆ مەبەستی خۆی بەکاری هێناون.

هەرچەندە سەرەتا ئەوە بڵاوکرایـەوە کـە ڕێکخـراوی (فـیمن) هـەوڵ دەدات بـۆ ئـەوەی توانـای کچـان و ئافرەتـان بـەدەربخات، وا خـۆی دەرخست کـە بـەرگری لـە پرسـەکانی ئافرەتـان دەکـات لەبەرامبـەر پرسەکانی توندوتیژی.

ماڵپــەڕی ئــیلاف لــەڕێی بەڵگەنامەیــەکی ڤیدیۆییــەوە ئــەوەی بەدەرخستوە کە ئەو ڕێکخراوە لەلایەن پیاوێکەوە بـەناوی (ڤیکتـۆر سفاتســک) بــەڕێوەدەبرێت و ئافرەتــانی جــوان و گــەنج بــۆ مەبەستەکانی هەڵدەبژێرێت.

ئەوەش ئاشکرا کراوە کە بەڕێوبەری ئـەو ڕێکخـراوە کـە دەرکـەوتوە ئافرەت نیەو پیـاوە ، هـەرگیز بـاوەڕی بـە گرنگیـدان بـە تواناکـانی ئافرەتان نەبوە.

ئــەو رێکخــراوە چەنــدین ئــابروچوونی دەرکــەوتووە، بــەڵام ئــەو ئابروچونــەوەی ئــەوجارە رێکخراوەکــە بــەرەو شکســتێکی گــەورەتر دێنێت.

بـانگخوازی ئیـسـلامی عـومەر عەبـدولکافی دەڵێـت: "ئـاوانەی داوای مافی ئافرەت دەکەن و داوای هەموو ئازادییەکی بـێ سـنووریان بـۆ دەکەن، ئەوانە مـافی ئافرەتییـان ناوێـت بەڵکـو خـودی ئافرەتیـان دەوێت" .

لە نامیلکەیەکـدا چـاوم بە وتەی ئـافرەتێکی تـازە موسـڵمان بـوو کەوت کە دەیووت: "هەرگیز بڕوا بە ڕۆژئاوا مەکەن کە باسـی مـافی ئــافرەت و ئــازادی بــێ ســنووری ئێــوە دەکەن بەڵکــو ئەوان مەسخەرەتان پێدەکەن نەک سەندنی مافتان"!



## پێوەری کردەوەکان:-

ژیانی دیموکراسی بریتییە لە: بنەمای شارستانیەتی ڕۆژئاوا کە لەسەر سود (الربا) بناغە کراووە، وە هیچ بەهایەک لەلایان بونی نییە جگە لە بەها ماددییە "سود"دارەکان، هەر شتێک قازانج و بەرژەوەندی تێدا بێت ئەوا ئەنجامی دەدەن، خۆ گەر نا وازی لێ دێنن ، بە بێ لەبەر چاوگرتنی خودی واقعی کارەکە، لەبەرئەوە پێوەری کارەکان لای ئەوان بریتییە لە: پێوەری سود و بەرژەوەندی. بەڵام پێوەری کارەکان لە ئایینی مرۆڤ پەروەری ئیسلامدا بریتییە لە: (حەڵاڵ و حەرام) هەر شتێک حەڵاڵ بێت دەتوانرێت ئەنجام بدرێت، وە هەر شتێک حەرام بێت پێویستە دوور بکەوینەوە لێی بە بێ گوێدان بە سود و قازانجەکەی.



# دیموکراسی و شورا(ڕاوێژ):-

دیموکراسی (شورا)ی نییه، دیموکراسی ڕێگەی فەرمانڕەواییە کە هەموو خەڵک و هەموو بەشەکانی تێدایە، وە هەموو کاروباری ژیان بە پێی تێڕوانینێکی دیاری کراو دەڕوات کە لە شەرعەوە سەرچاوەی نەگرتووە، وە فەرمانێکی شەرعی نییە وەک شورا. بەڵام شورا تاکە ڕێگەی حوکمڕانی نییە، هەتا هەموو بەشەکانی تیادا بێت، وە بنچینەیەک نییە لە بنچینەکانی فەرمانڕەوای، بەڵکو بریتییە لە: وەرگرتنی ڕاو بۆچوون، وە وەرگرتنی ڕاو بۆچوونیش هەندێک جار پێویستە و هەندێک جار پێویست نییە لە هەندێک حاڵەتدا{وەک: فەرمانەکانی شەرع}. وە شورا فەرمانێکی شەرعییە و دانراوی دەستی مرۆڤ نییە وەک دیموکراسی.

{دەربارەی گرنگی شورا خودا لە عەرشەوە بە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمووێت: (فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ)، واتە: "کەوابوو (ئەی محمد (د.خ) بەهۆی ڕەحمەتی خوداوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تورە و قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە

چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورە و داوای لێخۆش بوونییان بۆ بکە، **لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕاوێژییان پێ بکە، (دوای مەشورەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارتدا (کارێک ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا ببەستە،** چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن"

هەروەها ئەبوهورەیرە دەڵێت: کەسم نەدیوە هێندەی پێغەمبەر (د.خ) ڕاوێژ بە یارانی بکات.

لە ئیسلامدا ڕاوێژ لەسەر شتێک دەکرێت کە لە قورئان و سونەتدا ئاماژەی بە ڕوونی پێ نەکرابێت، بەڵام لە دیموکراسی دا لە هەر شتێکدا ئەگەرچی دژی بەها ئاینییەکانیش بێت دەبێت ڕایان قبوڵ بکرێت، ئەمەش ڕاگەیاندنی جەنگە لە گەڵ خودادا. ڕاوێژکاران لە ئیسلامدا دەبێت خاوەنی تایبەتمەندیگەلێکی باڵا بن، بەڵام لە دیموکراسی دا گەل و خەلکە جا چ نەزان بێت یان زانا}.

## ٦ ڕێساکانی فەرمانڕەوایی:

* فەرمانڕەوایی دیموکراسی لەسەر دوو فکرە دروست دەبێت:

ئـ. سەروەری بۆ گەلە.

ب. گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە.

* بەڵام فەرمانڕەوای لە ئیسلامدا دروست دەبێت لەسەر:

ئـ. سەروەری بۆ شەرعە نەک بۆ گەل.

ب. دەسەڵات بۆ ئومەتە، وە نوێنەرایەتی دەکرێت لەلایەن هەر کەسێکەوە کە شەرع جێ بە جێ بکات و پەیڕەوی لێی بکات.

## ٧ زۆرینە و کەمینە:-

* لە دیموکراسی دا فەرمانڕەوایی بۆ لایەنی زۆرینەیە، ئەگەرچی نارەواش بێت، وە زۆرینەش دەکرێت ئاوا بێت:

ئـ. زۆرینەی گەل بە ڕاپرسی گشتی.

ب. زۆرینەی نوێنەران لە دەنگداندا لەسەر پرۆژەیەکی دیاری کراو.

پ. زۆرینەی وەزیرەکان لە دانانی پرۆژەیەکی یاسای یان پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دیاری کراو.

**ت**. زۆرینەی سەندیکا و کۆمەڵەکان.

**ج**. زۆرینە بۆ بەخشینی متمانە بە وەزارەتێک یان لابردنی.

**چ**. هەمـوو بڕیارەکـانی ئەنجـومەنی نـوێنەران و وەزارەتەکـان کە زۆرینە دەیسەپێنن.

* بەڵام لە ئیسـلامدا فەرمـانڕەوای بـۆ شـەرعە، هەرچەنـدە کەمینـەش لەسـەر ئەو بۆچـونە بـن و ژمارەشـیان کەم بێـت، بەم شێوەیەی خوارەوە :

**ئـ**. پەیـڕەو کـردن و جـێ بەجـێ کردنـی فەرمـانێکی شـەرعی ناگەڕێنرێتەوە بە بۆچونی زۆرینە.

**ب**. بۆچـونی هـونەری و کەسـانی پسـپۆڕ و شـارەزا زۆریـنە نایسەپێنن.

**پ**. یەک حاڵەت هەیە کە بۆچـونی زۆریـنەی تیـا وەردەگیرێـت کە بریتییە لە قەبوڵ کردن و نەکردنی کارێکی مبـاح (ڕێـگە پێـدراو)، نمـونە پێغەمـبەر(د.خ) وازی لە بۆچـونی خـۆی هێنـا بـۆ بۆچـونی زۆریـنە لە کـاتی دەرچـونی لە مەدیـنە بـۆ ڕووبەڕووبـونەوە لەگەڵ کافران لە جەنگی ئوحوددا.



## شـێوازی فـەرمانڕەوای:-

شــێوازی فەرمــانڕەوایی لە دیموکراســی دا بــریتییە لە: سەرۆکایەتی یان پاشایەتی.

وە دروستە سیستەمی پاشایەتی بگۆڕدرێت بۆ سـەرۆکایەتی یـاخود بە پــێچەوانەوە. بەڵام شــێوازی فەرمــانڕەوایی لە ئیســلامدا: نە پاشــایەتی یە و نە ســەرۆکایەتیە، وە نە ئیمپراتــۆریەتی یە و نە فیدراڵی یە، بەڵکو تاکە شێوازی جیاوازە لە هەمـوو ڕژێمەکـانی تـر کە لە جیهاندا بونیان هەیە، کە بریتییە لە ( سیستەمی خـیلافەت ) کە ئەمیش بریتییە لە: سەرکردایەتی گشتی هەموو مسوڵمانان لە دونیادا لە پێناو پەیڕەویکردنـی فەرمـانە شـەرعیەکانی ئیسـلام، وە هەڵگرتنی بانگەوازی ئیسلامی بۆ هەموو جیهان. یاخود بەواتـایەکی تر ناونانی دەوڵەتی ئیسلام بە ناوی خـیلافەت ئەوە ناگەیەنێـت کە تایبەتە بە کۆمەڵەیەکی دیاری کراو یان بە خەڵکانێکی تایبەتمەند، بەڵکو ڕژێمی فەرمـانڕەوای لە ئیسـلامدا پێـی دەوترێـت "خـیلافەت" کە ڕژێمێکە بۆماوەی تێدا نییە. وە دروست نیـیە گۆڕانکـاری تیـادا بکرێت لە ڕژێمی خیلافەتەوە بۆ ڕژێمی سەرۆکایەتی یان پاشـایەتی ، یـان هەر جـۆرێکی تر.{باشـترین نمـوونەش لە مێـژوودا لەســەر ســەرکەوتویی شــێوازی خــیلافەت لە مەزنــایەتی و دادپەروەریــدا: خیلافەتــی ئیســلامی ســەردەمە زێرینەکـانی چـوار خەڵــیفە مـژدە

پێدراوەکە، وە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوری عبدولعەزیزە. لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا (ر.خ) قیبتیەک بۆ شکایەتی لە کوری والی میسر (عەمری کوڕی عاص) (ڕ.خ) کە لە کاتی بردنەوەی یارییەک لێی ئازاری داوە بە ناڕەوا، هاتە خزمەتی ئەمیری ئیمانداران، وە داوای حەقی خۆی کرد، ئەوە بوو عومەری فاروق لە دوای ئەوەی داوای کرد قیبتییەکە تۆڵەی خۆی بەبێ زیادەڕۆیی بکاتەوە، ئەم وتە جوانەشی فەرموو بە کوڕی والی میسر: "کەی خەڵکتان کردۆتە کۆیلە لە کاتێکدا دایکانیان بە ئازادی دەیانهێننە دونیاوە". وە دوای سەردەمی عومەری فاروق هەر لەنەوەی ئەم کەسایەتییە بەڕێزە عومەری کوری عبدولعەزیز پەیدا دەبێت کە حوکمەکەی تەنها دوو ساڵ و چەند مانگێکی خایاند بەڵام هێندە دادگەر و پابەندی شەرع بوو لە بڕیارەکانیدا وەهای لێهات ئیتر خەڵک لەبەر خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی کەسێکیان نەدەدۆزییەوە تا زەکاتی پێ ببەخشن، ئەوبوو هاتن بۆ لای عومەری کوری عبدولعەزیز پێیان گووت: "کەس نە ماوە زەکاتی پێ ببەخشین و خواردنێکی ئێجگار زۆرمان ماوە، چی لێبکەین؟" ئەویش فەرمووی: "برۆن، لەسەر کێوەکان داینێن تا نەڵێن لەسەردەمی خیلافەتی ئیسلامیدا باڵندەکان برسی بوون"}.

## ٩ (جهاز الحکم) دەزگای فەرمانڕەوای:-

دەزگاکانی فەرمانڕەوای لە دیموکراسیەتدا پێکدێت لە سێ دەسەڵات کە ئەمانەن:

ئـ. دەسەڵاتی یاسادانان (پەرلەمان).

ب. دەسەڵاتی جێ بەجێ کردن (وەزارەتەکان).

پ. دەسەڵاتی دادوەری (دادگاکان).

ئەم دەزگایانە هاوکاری دەسەڵاتەکانی تر دەکەن وەک سوپا و ئاسایشی گشتی و ئاسایشی ناوخۆ و دەزگاکانی تر.

بەڵام دەزگاکانی فەرمانڕەوای لە ئیسلامدا بریتین لە:

ئـ. خەلیفە.

ب. یاریدەدەری سەرپشک کراو.

پ. یاریدەدەری جێ بەجێ کردن.

ت. ئیمارەتی جیهاد کە سەرپەرشتی کاروباری: سوپا، ناوخۆ و دەرەوە و پیشەسازی دەکەن.

ج. والییەکان.

چ. دادگا.

ح. بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت ئەنجومەنی ئومەتی ئیسلامی.

{دادگا لە ئیسلامدا ڕێزێکی زۆری هەیە و دەتوانێت بە ئاسانترین شێوە ئەگەر خەلیفە هەڵەیەکی کرد لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات،

دیـاره خەلـیفەش نابێـت ددان نەنێـت بەهەڵەکەیـدا؛ چـوونکە لە ئیسـلامدا پۆسـتی خـیلافەت ئەرکە نەک مەنسـەب، لە حـوکمی ئیسلامیدا و لە چەرخی عوسمانیدا لەپەڕتووکی "حدائق الياسمين في ذکری قوانين الخلفاء والسلطان" دا بەم جـۆرە باسـی دەسـەڵاتی لـێ پێچیـنەوەی دادوەر دەکـات لە لە خەلـیفە: "سـوڵتان بایەزیـدی یەکەم کە ناسـراوە بە "بەزێـنەری ئەوروپییەکـان" لە شـەڕێکدا کە پـازدە وڵاتـی ئەوروپـی بەشـدارییان تێـدا کردبـوو تـوانی تێکیـان بشـکێنێت. ئەم سـوڵتانە بەڕێـزە، جارێکیـان وەهـا پێوسـتی کـرد لەبەردەم قازیـدا ئامادەبێـت و شـایەتی لەسـەر کارێـک بـدات، ئەو قـازییەش نـاوی "شـمش الـدين افنـدي"بوو. سـوڵتان چـووە ژووری دادگـا و لەبەردەم ئەوانـی تـردا بە پێـوە وەسـتا، قـازی سـەیرێکی سوڵتانی کـرد و پـێ وت: شـایەتی تـۆ وەرناگیرێـت و قبـوڵ نیـیە؛ چونکە تۆ نوێژەکانت بە کـۆمەڵ ناکەیـت، هەربـۆیە زۆر ئاسـییە لە شایەتی داندا درۆ بکەیت!

سـوڵتانیش دوای گوێبیسـتبوونی بڕیـاری قـازی بە بێـدەنگی چـووە دەرەوەی دادگا. لە هەمان ڕۆژدا فەرمانیـدا کە مزگەوتێـک لە نزیـک شوێنی نیشتەجێبوونی بنیات بنرێت".

جـا لەسـەردەمێکدا موسـڵمانان وەهـا قازییەکیـان هەبـوو، خـاوەنی وەها سوڵتانێکیش بوو!}

## ١٠ هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا:-

ئـ. دیموکراسی ڕێگە دەدات بە هەموو تاکەکانی گەل پێشبڕكێی و كێبڕكێ بکەن لەسەر گەیشتن بە کورسی فەرمانڕەوایی بەبێ ڕەچاوکردنی لێهاتویی و ڕەوشتی کەسایەتی و پابەندبونی بە ئایین تەنانەت ئەگەر بۆ نوێنەرایەتیش بێت.

ب. فەرمانڕەوا لە ڕژێمی دیموکراسی دا بە کرێ دەگیرێت.

پ. گەل فەرمانڕەوا هەڵدەبژێرێت بۆئەوەی ڕژێمی دیموکراسی بەسەریاندا بچەسپێنێت. ت. فەرمانڕەوا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو هەڵدەبژێردرێت بۆنمونە (٤ بۆ ٨) ساڵ.

**بەڵام لە ئیسلامدا هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا بەم شێوازەیە:**

ئـ. لە ئیسلامدا مەرجە ئەو کەسەی خۆی دینێتە پێش بۆ ئەم کارە پیاو بێت نەک ئافرەت{بێجگە بوون بە خەلیفە ئافرەت دەتوانرێت دەسەڵاتی فەرمانڕەوای زۆربەی کاروبارەکانی پی بدرێت بە پێی ئەو تواناییەی کە تێیدا هەیە}، مسوڵمان بێت نەک بێ باوەڕ، باڵغ بێت نەک منداڵ، ژیر بێت نەک شێت، ئازاد بێت نەک بەندە یان هاوشێوەی بەندە دەسەڵاتی بەسەرەوە بێت. {ئاشکرایە، بەندە لێرەدا مەبەستی خزمەتکارە یان ئەو جۆرە بەندایەتییە کە لە کۆندا هەبوو، ئیسلامی مەزن ئەم جۆرە بەندایەتییە بنبڕ کرد، بەڵام لە ڕژێمی دیموکراسی دا بە بەندە بوو گەلێک نمانیان و ڕوونە،

دەبینیـــت کە زۆربەی ســـەرکردەی وڵاتە بـــێ هێزەکـــان پاشـــکۆ و بەنـدەی فەرمـانی وڵاتە زلهێزەکـانن، یـان زۆرەیـان بەنـدە ئەممـان بەندە شەهاوت و پارە، جا پێویستە لە حووکمی ئیسلامیدا کەسێک بکـرێتە فەرمـانڕەوا کە تایبەتمەنـدی چـرای لە خۆیـدا بەرجەسـتە کردبێـت، کە چـرا تایبەتمەنـدییەکی گەلێـک زێرینـی هەیە ئەویـش: خۆی دەسوتێت لە پێنـاو ڕووناککردنەوەی کە سـانی تـر، هەروەک چۆن عومەری کـوڕی خەتـاب بە ئاشـکرا ئەم تایبەتمەنـدییەی تێـدا بەرجەسـتە ببـوو}، وە پێوسـتە خەلـیفە دادگەر بێـت نەک لە ئـاین دەرچـوو، وە مەرجـی شـیاو تـر ئەوەیە کە موجتەهیـد ( تـوانی هەڵهێنجانی لە ئایەت و فەرموودەکان) بێت وە ...هتد.

ب. فەرمانڕەوا لە ئیسلامدا بە کرێ ناگیرێت، وە ئەو بڕە پـارەیەی کە وەریـــدەگرێت لە بـــری ئەو کـــارەیە کە پێـــی هەڵدەســـتێت، لەبەرئەوە ئەگەر سـەرچاوەیەکی بژێـوی تـری هەبێـت ئەوا دروسـت نییە هیچ شتێک وەربگرێت لە ( بیت المـال).{بەڵام لە دیموکراسـی دا ســـەرکردەی وەهـــا بـــوونی هەیە کە مـــوچەکەی بەشـــی بژێـــوی هەزارەها هەژار و زەبـوون دەکـات، کەچـی لە ئیسـلامدا فەرمـانڕەوا هەروەک میلەت سادە دەژی، زۆرجاران لە مـافی خـۆی خۆشـدەبێت لە پێنـاو ئومەتـدا، جارێکیـان خێروخێـرات کـرا، خێـرکەران بیریـان دەکردەوە کە هەژارترین ماڵ کام ماڵەیە لە مەدینەدا تا خێـری پـێ

ببەخشن، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە لە مالی خەلیفەی موسڵمانان "عومەری کوڕی خەتاب" هەژارتر بوونی نییە، کاتێکیش خێرەکەیان بۆ برد قبوڵی نەکرد و داوایکرد بیبەخشن بە موسڵمانان}.

**پ**. لە ئیسلامدا ئومەت بەڵێن دەدەن بە فەرمانڕەوا لەسەر کارکردن بە پەرتوکی خودا و فەرمودەکانی پێغەمبەر (د.خ)، یان جێ بەجێ کردنی فەرمانە شەرعییەکانی ئیسلام.

**ت**. خەلیفە ماوەیەکی دیاری کراوی نییە هەتا ئەو کاتەی مەرجە شەرعیەکانی تیا بێت، وە توانای هەستان بە کاروبارەکانی فەرمانڕەوای هەبێت یان جێ بەجێ کاری فەرمانە شەرعییەکان بێت.

## ١١ هەڵگەڕانەوە و سەرپێچی کردن:

لە دیموکراسی دا دروستە کە لە فەرمانڕەوا هەڵبگەڕێیتەوە و خۆپیشاندان بکەیت بەرامبەری و گوێڕایەڵی نەکەیت و سەرپێچی کردن لە دژی ڕابگەیەنیت، بەڵام لە ئیسلامدا دروست نییە هەڵگەڕانەوە و سەرپێچی کردن تەنها لە یەک ساتدا نەبێت کە ئەگەر خەلیفە فەرمان بکات بە تاوان و سەرپێچی کردنی شەرع.{هەرکات زانیت خەلیفە بەرەو هەڵدێر

هانگاو دەنێت پێویستە بە حیکمەتگەرایییەوە لادانەکەی پێ ڕابگەیەنیت و ئامۆژگاری بکەیت، نەک بارودۆخ و هێمنی خیلافەت و دەوڵەت بشێوێنیت لەبەر هەڵەیەکی خەلیفە}.

## ١٢ نەیاری (المعارضة) و لێ پێچینەوە:-

لە دیموکراسی دا کۆمەڵگا دابەش دەبێت بۆ دوو بەش کە بریتین لە دەسەڵاتدار و نەیاران. بەڵام لە ئیسلامدا، کۆمەڵگا دابەش نابێت بۆ دوو بەش، بەڵکو گەل یان نوێنەرانی ئومەت هەڵدەستن بە لێپرسینەوەی فەرمانڕەوا، وە ئەگەر شیاوی لابردن بوو لە ڕووی شەرعەوە ئەوا دادگای (المظالم) لەسەرکار لای دەبات، واتە: یان گوێڕایەڵی بۆ فەرمان بەدەست (ولي آلامر) لەگەڵ لێ پێچینەوە، یان لابردنی.

## ١٣ دادگا:-

لە ڕژێمی دیموکراسی دا: دادگا مەدەنییە.
بەڵام لە ئیسلامدا: دادگا شەرعییە.

{دادگای مەدەنی یاسا و ڕێساکانی لەلایەن مرۆڤەکانەوە دەنوسرێنەوە، بەڵام دادگای شەرعی یاسا و ڕێساکانی بریتییە لە: پەیام و شەریعەت و ئایینی خوای پەروەردگار}.

## ١٤ پێکهێنانی حیزبەکان:-

لە ڕژێمی دیموکراسی دا دروستە حیزب دروست بکرێت لە سەر بنچینەیەک کە دژی بنچینەکانی ئیسلام بێت، واتە: حزبی سکۆلاری (عەلمانی) یان نەتەوەی یان بێ دین بێت.

بەڵام لە ئیسلامدا دروست نییە حیزب دروست بکرێت جگە لە حیزبی ئیسلامی کە پابەند بێت بە ئیسلام لە ڕووی بیروباوەڕ و سیستەمی ژیانەوە.

## ١٥ سیاسەتی دەرەوە:-

لە ڕژێمی دیموکراسی دا سیاسەتی دەرەکی لە لەسەر بنچینەی ڕێزگرتنی سنوری دەوڵەتی و ئاوی هەرێمەکان دروست دەبێت؛ چونکە زۆرکردنە لەسەر ڕێزگرتنی ئازادی گەلان لە هەڵبژاردنی ڕژێم و یاسا و فەرمانەکانی. بەڵام لە ژێر سایەی ڕژێمی فەرمانڕەوای ئیسلامیدا سیاسەتی دەرەوە پەیوەستە بە جیهاد بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام یان هەڵگرتنی بانگەوازەکەی، وە هەروەها سنوور و بەربەستە ماددییەکان تێک دەشکێنێت بۆ دەرباز بوونی

خەڵـک لە بەنـدایەتی مـرۆڤەوە بـۆ مـرۆڤ بـۆ بەنـدایەتی خـودای بەنـدەکان.{خوێنەری هێـژا، دەکرێـت بپرسـیت باشـە بـۆچی ڕێـزی سـنوری نەتەوەکـان لە ئیسـلامدا ناگیرێـت یـان بە مانـایەکی تـر دەبەزێنرێت؟

وەڵام/ بەڵام ئەم بەزاندنە مانای بێ ڕێزی کردن نییە، بەڵکو مانـای ڕزگارکردنی مرۆڤەکانە لە کـۆیلایەتی و هەسـتی کـین لـێ بـوونەوە بەرامـــبەر بە نەتەوەکـــانی تـــر و دروســـتکردنی هەســـتی ناسـیۆنالیزمی (ناتەوایەتی)، بەڵکـو ئیسـلام دەیەوێـت نەتەوەکەن دوور لە دەمــارگیری نەتەوەیــی پــێکەوە بە ئاشــتی ژیانییــان ڕا بگـوزەرێنن، هەروەک چـۆن مێـژوو ١٤ سـەدەی حـوکمی خـیلافەت بەڵگەیەکـی ئاشـکراو نمایـانە، خیلافەتـی ئیسـلامی دەیەوێـت ئەو ئایاتەی خودا جێ بە جێ بکـات کە دەفەرموویـت: (يَـٰٓأَيُّهَـا ٱلنَّـاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَـرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْـنَـٰكُمْ شُـعُوبًا وَقَبَآئِـلَ لِتَعَـارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْـرَمَكُمْ عِنـدَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰـكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِـيمٌ خَبِـير)،[الحجـرات: ١٣]، واتە: ئـەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێر و مێیـەک دروسـتکردووە (کەباوکە ئادەم و دایکـە حەوایـە)، کردوومـانن بەچەنـدەها گـەل و تیرە و هـۆزی جۆربـەجۆر، تـا یـەکتر بناسـن و پەیوەنـدیتان خـۆش بێـت بەیەکـەوە. بەڕاسـتی بـەڕێزترینتان لای خـوا ئـەو کەسـانەتانە کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە و پارێزکارە، بێگومـان

خوا زاناو ئاگایە بەهەمووان. کەوابوو لە خیلافەتی ئیسلامیدا هیچ نەتەوەیەک لە نەتەوەکان بە ڕێزترنین لەوی تریان مەگەر ئەوەیان کە زیاتر پارێزکاری فەرمانەکانی ئیلاهی بێت. بە درێژایی ١٤ سەدە لە ژێر ئالأی ئیسلامدا من و تۆ بوونی نەبووە، بەڵکو هەموو نەتەوەکان وەک خوشک و برا لە ژێر حوکمی شەرعدا ژیانییان بە کامەرانی گوزەراندووە، بە بێ جیاوازی ئەوەتا یەکێک لە سەرکردە سکۆلارییە کورستانی باکوور "عەبدوڵڵا ئۆجەلان" لە بەیاننامەی نەورۆزی "٢٠١٣"دا لە "ئامەد"دا دەان بەو ڕاستییەدا دەنێت کە لە خیلافەتی عوسمانییدا "کورد و تورک" بە ئاشتی و بێ جوداوازی کردنی نەتەوایەتی و مافداری پێکەوە دەژیان". بەڵام ئەفسوس هەر لەگەڵ ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی ئیسلامی لەسەدەی بیستدا و هاتنی فکرەی دیموکراسی ئیدی شۆرشی ڕەگەز پەرستی دەستی پێکرد، هەنووکەش لەبەردەوامیدایە.

ڤایسی نوسەری ڕۆژئاوای لە پەڕتووکی "الاسلام علی مفترق الطریق"دا، دەڵێت: "ئیسلام ئاوەدانەکەرەوەیە نەک داگیرکار، ئیسلام کە ناوچەیەک ئازاد دەکات کەس هان نادات بۆ خۆشەویستی زاڵبوون. ئیسلام هیچ جۆرە خۆپەرستییەکی ئابوری یا نەتەوەیی تێدا نییە و هیچ جۆرە هۆکاری خۆشگوزەرانی شوێنکەتوانی لەسەر حسابی گەلانی تر تێدا نییە. ئیسلام کە

بەسەر ئادەمیزاددا پێویست کراوە لە پێناو ئەوەی سوود بەخۆی و دەوروبەرەکەی بگەیەنێت لەسەر ڕەوشتی بەرزی ئیسلامی تا بۆ ئاسوودەی ئادەمیزاد بژی و بمرێت، وە بۆ هاوکاری کردن لەسەر زەمیندا". هەروەها تۆماس کارلایل لە پەرتووکی "المستشرقون و الاسلام"دا، دەڵێت: "ئیسلام ئایینی ئاشتیە هێز و توانای بۆئەوە کۆناکاتەوە کە کاری جەنگی پێ ئەنجام بدات، بەڵکو هەمیشە هەر بۆ ئاشتی کار دەکات. ڕۆژئاوا کە وڵاتان داگیر دەکات مەبەست لێی بڵاوکردنەوەی بیرباوەڕ و شارستانییەت نییە، بەڵکو تەنها مەبەستی داگیرکردنە، وە بەناوی مەسیحیەتەوە کاری داگیرکردن ئەنجام دەدات، هەربۆیە قەد لە کاری تەبشیریدا سەرکەوتوو نابێت؛ چونکە دڵسۆز نییە و مەبەستی داگیرکردنە.

هەربۆیە دەڵێین: سڵاو لە حوکمی ئیسلامی کە نەتەوەکان دەکات بە خوشک و برا، فەزڵی کەسیشیان نادات بەسەر ئەوەی تریاندا مەگەر لە خواترسترینییان و پارێزکارترینییان}.

## ١٦ سـنـوور:-

ڕژێمی دیموکراسی پێداگری دەکات لە چونەوە یەک و زیاد بوونی ژمارەی دەوڵەتان یان ناو دەبرێت بە ڕێزگرتنی سەربەخۆی ئەو دەوڵەتانە.

بەڵام ڕژێمی خیلافەت ددان نانێت بە سنووری دەستکرد دا، وە ددان نانێت بە سەربەخۆیی هیچ وولاتێکی ئیسلامی تر لەگەڵ وڵاتێکی تردا، وە هەموو دەوڵەتەکانی جیهانی ئیسلامی پێویستە ملکەچ بن بۆ دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلام ، وە هەموویان بەیەک دەوڵەت دادەنرێن، وە دەوڵەت لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە دابەش دەکرێت بۆ ویلایەت، یەک ئومەت، یەک سووپا، یەک ئاڵا، یەک دارایی ....هتد.

## ١٧ نەتەوە و هۆزەکان:-

ڕژێمی دیموکراسی ڕێزی نەتەوە و هۆزەکان دەگرێت بەوەی خوو و ڕەوشتە جاهیلییەکان و زیندوودەکاتەوە و پارێزگاری کردن لێیان، {ئیدی بەبێ گوێدانە پلەیەکی مەعریفی بالآ}، بەلآم ڕژێمی فەرمانڕەوای لە ئیسلامدا هەموو نەتەوەو تیرە و هۆز و خوو ڕەوشتە جاهیلیەکانیان دەتوێنێتەوە بە سیستەمێکی شەرعی ئیسلامی دایان دەرێژێتەوە.

{لە ڕژێمی دیموکراتیدا دۆستایەتی لەسەر بنەمای مەسڵەحەتی مادییە، بەلآم لە ئیسلامدا لەسەر بەنەمای ئەخلآق و حەقبوون و پەیمانەدانە بەوانەی کە حەقن}.



## ئازادییەکان:-

دیموکراسی ئازادییەکان پیرۆز ڕادەگرێت و ئازادی بە تێگەشتنی ڕۆژئاوا بە مانای ڕزگاربوونی مرۆڤ نایەت لە کۆیلایەتی ، وە بەندە لایان بوونی نییە، وە بە مانای ڕزگاربوون نایەت لە داگیرکەر، بەڵکو بریتییە لە داگیرکردنی گەلان{خوێنەری هێژا، وەک باسکرا ئازادی لای ڕۆژئاوا بەو جۆرەیە لە هەموو مێژووی ئیسلامدا ڕێژەی کوشتنی کافرەکان بەدەستی موسڵمانان کەمترە لە ڕێژە کوشتنی ڤێتنامییە بێ تاوانەکان کە کاتێک ئەمریکا ویستی خاکەکەیان لێ داگیربکات دوای ئەوەی کۆمەڵێکی کۆمۆنیست توانییان لە ساڵی ١٩٤٥ کۆتای بە حوکمی فەرەنسییەکان بهێنن بەسەرکردایەتی هۆشی مین، وە ئەمان دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەوە بوو ڤێتنام دابەشبوو بەسەر دووبەرەدا باکور بەر کۆمۆنیستەکان و باشور بەر دژەکۆمۆنیستەکان کەوت، بە هۆی ئەم ڕووداوە ئەمریکا زانی بەرژەوەندییەکانی لەو ناوچەیەدا لە مەترسی دایە، دەستی کرد بە یارمەتی دانی باشور هەربۆیە بەناردنی سوپا و فیتنە جەنگێکی بەرپاکرد کە بووە هۆی کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە ڤێتنامییەکان کە زیاد لە ملیۆنێک ڤێتنامی بە دەستی هێزی داگیرکاری ئەمریکی لە ساڵانی ١٩٥٥-١٩٧٥. کەچی تازە بە تازە ئەمریکا و ڕۆژئاوا

موسڵمانان به تیرۆر ناو دەبەن که ئەمه یەکێکه له کۆمیدی ترین درۆکانی مێژووی مرۆڤایەتی! دیسانەوه ئەمریکا له ساڵی ١٩٤٥ بۆمبی ئەتۆمی له ناکازاکی و هێرۆشیمادا بەهۆیەوه دوو سەد هەزار هاوڵاتی ژاپۆنی مردن! ئایا ئەمەیه دیموکراسی! یان لەجەنگی بۆسنه/کۆسۆڤۆ دا زیاتر له نیو ملیۆن مرۆڤ مردن که زۆرینەیان موسڵمانان بوون! ئیدی خۆت بریار بده ئایا ئیسلام مرۆڤ دۆسته یاخود ئافسانەی دیموکراسی له پێناو پتر بەرچاورونکردن لەسەر حەقیقەتی ئەو دەوڵەتەی که هەڵگری دیموکراسییه، سەیرێکی ئەم داتا سەیر و سەمارانه بکه و خۆت بڕیاربده بەویژدانەوه ئایا پەیامی خیلافەت دادوەرتره یاخود دیموکراسی ئەگەر ئیماندارییت یاخود نا:

*** ئەمریکا بکوژی "١١٢"ملیۆن کەسە:**

ئەمریکا لەسەردەمی دوای رۆشنگەری و بیری ئازادەوه دروست بوو که مێژووەکەی بۆ دووسەده و نیو لەمەوبەر ئەگەڕێتەوه و خاوەنی تازەترین مێژووه بەڵام خوێنمژترین ئیمپراتۆریەتی جیهانه و دڕندەترین و وەحشیترین دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی هەیه که جگه لەبەرژەوەندی خۆی کەسی تر ناخوێنێتەوه.

گوزەرێکی کورت دەکەین و ئەو سەرژمێریانه دەخەینه بەرچاوتان

*لەشەڕی هندیه سورەکاندا (خەڵکی ڕاستەقینەی ئەمریکا)

١٨.٥ملیـــــۆنی هنـــــدیه ســــوری لەنـــــاوبرد لەڕێگـــــای:

١: ٤١جەنگـــــــــــــی بڵاوکـــــــــــــــردنەوەی ســـــــــــورێژە.

٢: ٤ جەنـــــــــــــگ بەبڵاوکـــــــــــــــردنەوەی تــــــــــــاعون.

٣: ١٧ جەنـــــــــــــــــــــگ بەئـــــــــــــــــــــــــاوڵە.

٤: ١٠ جەنـــــــــــــــــــــگ بەئەنفلـــــــــــــــــــــــونزا.

٥: ٢٥ جەنـــگ بەســـیل و دیفیتریـــا و تـــایفوس و کـــولێرا.

بروانە: منیر العکش/ امریکا والإبادات الجماعیه.

*** ئەمریکــــــــــــــا و شــــــــــــــەڕی کۆریــــــــــــا:**

نۆوام چومسکی دەڵێت: لەساڵی ١٩٤٥ کاتێ هێزەکانمان هاتنە ناو کۆریاوە زیاتر لە "١٠٠٠٠٠"کۆریمان لەناوبرد. ئەمە جگە لەکاولکردنی هەردوو کۆریـــا و لەنـــاوبردنی "١"ملیـــۆن خەڵکـــی مەدەنـــی و ئاوارەکردنی "٤"ملیۆن کۆری.

***ئەمریکــــــــــــــا و شــــــــــــــەڕی یابــــــــــــــان:**

لە٦ی ئابی ١٩٤٥ فڕۆکەکانی ئەمریکا شـاری هیرۆشـیمای یابانیـان بۆردمـــان کـــرد بەبـــۆمبی ئەتـــۆمی کە بـــووە هـــۆی وێرانکردنـــی ٦٨%شـــارەکە بەتەواوەتـــی و لەنـــاوبردنی ٦٠-٧٠هەزار کەس ئەمە جگە لەدەیان هەزار کەسی توشی برینـداربون و نەخۆشـی کوشـندە کرد.

پـاش سـێ ڕۆژ لەبۆردومـانی هیرۆشـیما، پەلامـاری ناکازاکیـدا و بەچەکـی ئەتـۆمی لەو شارەشـیدا و ٤٠هەزارکەسـی بێتـاوانی کـردە قوربانی ئەمە جگە لەدەیان هەزارکەسی بریندار و پەککەوتە کرد.

***ئەمریکـــــــــــا و شـــــــــــەڕی پەنەمـــــــــــا:**

بەنـاوی هەڵەی تەکتیکـیەوە پـاش چەنـدین جـار لەبیـانوگرتن بەو وڵاتە پەلاماری ئەو وڵاتە دراو ٣هەزار پەنەمی تێدا قەتڵ و عام کرد کە زۆربەیان مەدەنی بوون.

***ئەمریکـــــــــــا و جەنگـــــــــــی دژی ڤێتنـــــــــــام:**

لەنێوان ساڵانی ١٩٦٥-١٩٧٥ سوپای ئەمریکا ملیۆنەهـا تەن بـۆمبی کیمیـاوی ناسـراو بە"Agent Orange"یـان بەکارهێنـا کە ئەم جۆرە بـۆمبە لەجیهانـدا قەدەغە کراوبـوو. کەئەمە نەک بـووە هـۆی لەناوبردنی سەدان هەزار کەس بەڵکـو هـیچ شـێوازێکی تـری ژیـانی نەهێشت لەزۆربەی ناوچەکـانی جیهـان. ئەمە جـگە لەوەی لەسـاڵی ١٩٦٧ چەندین سـەربازی ئەمریکـی هەسـتان بەلێکـردنەوەی سـەری سـەربازە ڤێتنامیەکـان و نمـایش کردنیـان کە دواتـر لەفلیمێکـی دۆکیۆمێنتیدا بەناوی (هەستانی عەنقا) نمایش کرا. هەروەها یەکێ لەفرۆکەوانەکان بەناوی (هیۆ تۆمسۆن) کەلەساڵی ١٩٦٨ کەبەسـەر گوندی سۆنغ مای تێپەریوە دەڵێ لاشـە ئەتـوت مێـرولەیە لەزۆریـدا

... ئـاوی شـارەكەش ژەهـراوی كرابـوو هەركەس بیخـواردایەتەوە لەناوی ئەبرد.

سیچ سین هاو كە ڕاهیبێكی ڤێتنـامیە دەڵـێ: جەنگی ڤێتنـام تـا ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٦٣بـووە هـۆی كـوژرانی زیـاتر لە "١٦٠"هەزار كەس و ئـازاردان و شـێواندنی "٧٠٠"هەزار كەس و دەسـتدرێژی بۆسـەر ناموسـی "٣١"هەزار ئـافرەت و ناوسـكی "٣٠٠٠"كەس بەزیندوێتی دەركران. "٤٦"گونـد بەچەكی كیمیـاوی هێرشـی كـرایە سەر. ئەمە جگە لەبێسەروشوێن بونی "٣٠٠"هەزار ڤێتنامی.

***ئەمریكـــا و شـــەڕی لە گواتیمــــالا:**

ناعوم چۆمسكی دەڵێ: ئەمریكا شـێوازی ئاسـایی كوشـتنی پەیـرەو نەكرد لەم نـاوچەیە بەڵكـو بەو پەڕی دڕنـدەییەوە جـوڵایەوە لەگەڵ خەڵكی ناوچەكە، لەوانە ئافرەتیان بەبنـی پێیـان هەڵدەواسـی دوای ئەوەی كە مەمكیـان بڕیبـون و كچێنیـان نەهێڵرابـوو.. سـەربڕین و لەنـاوبردن و هەروەهـا هەڵواسـینی منـداڵان بەدیـوارەوە... لەنێـوان ١٩٥٢-١٩٧٣ز ئەمریكیەكـان نـزیكەی "١٠"ملیـۆن چینـی و كـۆری و ڤێتنـامی و لاوسـی و كەمبۆدیـان لەنـاوبرد. هەروەهـا لە١٩٨١ لەگواتیمالادا نزیكەی ١٣٩منداڵیان سـەربڕی و ١٥٠هەزار جوتیاریـان لەناوبرد.

*** ئەمریکـــــــــــــا و شـــــــــــەڕی کەنـــــــــــداو:**

لەم شــەرەدا بەدەیـان چەک و گـوللەی یۆرانیـۆمی درا لەعێـراق و کەتاوەکو ئێستا و بـۆ ساڵی دواتـریش کـاریگەری دەمێنـێ لەسـەر خەڵکی عێراق بەژن و پیاویانەوە. هەروەها نزیکەی ملیۆنێک خەڵک تیایـدا بـونە قوربـانی و ئەمە جـگە لەو کاریگەریـانەی کە بەجێـی هێشـتن. وەک چۆمسـکی لەبـارەیەوە دەدوێ پشــت ڕاسـتی ئەم قسەیە دەکاتەوە.

***ئەمریکـــــــــــــا و شـــــــــــــەڕی کوبـــــــــــــا:**

ئەمریکا ئەتوانین بڵێین لەو شەرەیدا تاکتیکێکی نوێی دانا ئەویـش بەوەی جەنــگەکەی لەشــێوازی پەلامــاردان و کوشــتارەوە گــۆڕی بەهــۆی ئەو میـدیایەی کەلەســەری بـوو هەربـۆیە شــەڕی ئـابوری ئەنجامــدا و بەهــۆی ئەمەشــەوە بەدەیــان هەزارکەســی توشــی مادەهۆشـبەرەکان کـرد و بەگـرتنەوەی لایەنـی ئـابوری ئەو شـارە بەدەیان هەزارکەس بوونە قوربانی و لەناوچون و گیـرۆدە و زەلیلـی کـردن کە بەدرِنــدەترین جــۆری شــەڕکردن نــاودەبرێ کە هەمــوو ڕێگـایەکی ژیـان و گـوزەرانی لەخەڵکـی شـارەکە گـرتەوە. ئەمەش تەنهـا لەنێـوان سـاڵی ١٨٩٨-١٩٠٢.. نەک دواتـر کە پەلامـاردرا و خەڵکێکی زۆری لێ لەناوبرا لەدەورانی جۆن کەنەدیدا.

*** ئەمریکـــــــــــــا و شـــــــــــەڕی لە فیلیپـــــــــــــین:**

لەسـالّی ١٨٩٩ کـاتێ چـووە نـاو فلیپینـەوە هەر لەسـێ سـالّی ئەوەڵیەوە سـەدان هەزار کەسـی لەنـاوبرد لە کـور و کـچ و گەنـج و پیر و مندالّ و هەروەها دەستکرد بەگاور کردنی خەڵکی ناوچەکە و قەتلّوعامکردنی ئەوانانەی نەئەچونە ژێرباری.

***ئەمریکــــــــــــا و شــــــــــــەڕی لەئەفغانســـــــــــــتان:**

کاتێ لەسالّی ٢٠٠١ ئەمریکـا بڕیـاری شـەڕیدا لەگەڵ ئەم ولاّتە وەک بینیمان چۆن ئەو ولاّتە بۆردومـان کـراو چۆن بێویژدانـانە کەوتـنە خەڵکـی ئەو ولاّتە بەبـێ جیـاکردنەوەیەک بـۆ خەڵکـی مەدەنـی و بەدەیان هەزارکەسیان کردە قوربـانی و ولاّت و شارەکەشـیان کـردە ولاّتێداڕوخاو و ناجێگیر.

***ئەمریکـــــــــــا و داگیرکردنـــــــــــــی عێـــــــــــــراق:**

سالّی ٢٠٠٣پەلاماری عێراق درا و بەناوی لەناوبردنی چەکی ئەتۆمیە و بەناوی خزمەتەوە ولاّتی عێراقیـان کـاول و وێـران کـرد و تـاوەکو ئێستا بەملیۆنان خەڵک بونەتە قوربانی و کە هۆکاری سەرەکی ئەم لەناوبردنە و ناجێگیریە بـۆ خراپـی ئەو پـلانە دائەنـرێ کە ئەمریکـا ئەنجامیدا لەم ولاّتەدا.

بەرێـزان ئەوەمـان لەیـاد نەچێـت ئەمریکـا لەوەتەی بـۆتە زلهێـزی جیهـان چاوپۆشـی لەسـەدان دەوڵەت کـردووە کە بەربـونەتە گیـانی

خەڵكی خۆیان بەدەستە جەمعی كاولكاری و خراپەكاریان ئەنجام داوە كە هۆكـاری سـەرەكی ئەم خراپـی وڵاتـانەش لەئەسـتۆی ئەمریكـادایە كە بەنـاوی مـافی مـرۆڤ و دیمـوكراتی ئـازادیەوە ئەم گۆماوی خوێنەی لەمێژوی خۆیدا تۆماركردووە.

خـوێنەری خـاوەن ویـژدان و فامكـار ئـائەمەیە حەقیقەتـی دیموكراسـی و هەڵگرانـی ئەمە پەیـامە دوو ڕووخشـارە؟!} وە هیچ كەس گومـان لەوە ناكـات كە ئازادییەكـانی ڕۆژئـاوا بریتـی بێـت لە نەیـاری لەگەڵ داگیـركەران بەڵكـو ئـازادی لای ئەوان بریتییە لە چوار شت كە ئەمانەن:

**یەكەم// ئازادی بیروباوەڕ:** مرۆڤ بۆی هەیە هەر بیروباوەڕێـك خـۆی دەیەوێت باوەڕی پێ بهێنێت بە بێ هـیچ زۆر لێكـردن و پەسـتانێك وە مافی ئەوەی هەیە كە واز لە بیروبـاوەڕ و ئـایینەكەی بهێنێـت و بیگۆڕێت بۆ ئایین و بیروباوەڕێكی تـری تـازەتر، وە لە بیروبـاوەڕی ئەواندا مسوڵمان بۆی هەیە بگۆڕێـت بـۆ ئـایینی گـاور و جـولەكە و بوزی و شیوعیەت بەوپەڕی ئازادیەوە.

**دووەم// ئـازادی بیروبۆچوون:** دروسـتە لە ژێـر سـایەی دیموكراسـی دا تاك هەر بیرو بۆچون و فكرێك هەڵبگرێت یـان هەر بیروبۆچـوون و فكرێك بڵێت و بانگەشەی بـۆ بكـات. وە بەهەر شـێوەیەك بیەوێـت دەریببڕێت و دەوڵەت و تاك بۆیان نیـیە ڕێگـری لـێ بـكەن، بەڵكـو

یاسا دادەنرێت بۆیان بۆ پاراستنی ئازادی بیروڕا، وە پارێزگاری دەكرێت لەو بۆچونانەی كە پێچەوانەی ئایینن یان هێرش دەكەنە سەر ئایین و پێغەمبەران و نێرراوان (د.خ) لێ بێت.{بەبێ گوێدانە هەستی موسڵمانان كە دووەم گەورەترین ئایینی سەر زەمینن}.

**سێهەم// ئازادی موڵكداری:** بریتییە لەو ئازادیەی كە ڕژێمی سەرمایەداری كە بواری ئابوری لێوە سەرچاوە دەگرێت، وە بیری داگیركردنی گەلانی تێدایە و سەرماییەیان بۆخۆی دەبات، وە ڕێگە دەدات بە مرۆڤ كە ببێتە خاوەن سەرمایە بەهۆی سود و قۆرخكاری و فێڵ و تەڵەكەبازی و قومار و هەڵخەڵەتاندن و داوێن پیسی و نێربازی و بەكارهێنانی جوانی ئافرەت و نەرمونیانیەكەی بۆ بە دەستهێنانی ماددە و سەروەت و سامان، وە بەهۆی دروستكردنی شەراب و فرۆشتنیەوە.{كۆمپانیای "شێڵ" كە كۆمپانیایەكی هۆڵەندی و بەریتانییە، وڵاتی نێجیریان بە تەواوی ژێرە و ژوور كرد و زۆربەی نەوتەكەیان برد، بەبێ ئەوەی پارەیەكی كەمیش بۆ خەڵكەكەی بێت، یان ساڵانە ئەمریكا چەند هەزار تەن بەس خۆڵ و خاشاك فرێ دەداتە نێو خاكی ئەفریقاوە، لەهەمان كاتدا سیاسەتەكانی بەریتانیا و فەرنسا وەهایان لە نەوەكانی حامی كوری نوح كردووە هەموو مانای ژیان لای ئەوان چۆن ئەمرۆ بژین و نەمرنە، ئەمە لە كاتێكدا دەوڵەمەندی خاكی ئەفریقا بەكانزا فلزی و

نافلزیەکـان بـێ وێـنەیە، لەم قـارەیەدا کە قوربـانی دەسـتی و دیموکراسییە جیاواز لە زۆربەی قارەکانی تر خاوەنی هەمـوو جـۆرە سروشتێکە بۆ نموونە ئەوروپا بیابانی نییە، بەڵام ئەفریقا بیابـان و دارستانیشـی هەیە، نەوت، ئەڵمـاس، غـاز هەموویـان بەشـێکن لە بەهەمداری خاکی ئەفریقا، بەڵام دیموکراتخوازان بەبێـدەنگی هەمـوو ئەم خاکە بەتاڵان دەبەن، تەنـانەت هێنـدە بـێ ویـژدانن کۆمپانیـای ئەدیداس زۆربەی لۆکە و کەتانەکانی ئەفریقـا دەبـات ئایـا دەزانیـت چەندە کرێ دەداتە کرێکارەکان کە خەڵکی ئەفریقـان لە ڕۆژێکـدا؟ تەنهـا چەنـد سـەنتێک کە لە دۆلارێکـیش کەمتـرە! ئەمە جـۆرە سیاسەتەی ڕۆژئاوا کە چاودێرەکەی هێزی سـەرمایەدارییە هەمیشـە وتەکەی شەهید حەسەن بەنامان بیردەخـاتەوە، بەڵام لە حـوکمی ئیسـلامیدا چـونکە هێـزی چاودێریکـاری خـودای پەروەردگـارە لای دەسەڵات داران و خەلیفە و دادوەرەکـان مرۆڤەکـان خـاوەنی ڕێـزن، مەحـروم نـاکرێن لە بەرهەمـی خـاکی خۆیـان و کـار دەکرێـت بـۆ ڕۆشنبیرکردنی مرۆڤەکان و دروسـت کردنـی گیـانی خۆشەویسـتی و ڕێـز و یارمەتیـدانی یەکـدی و دابینکردنـی دادگـای بـێ لایەن و ئامرازەکـانی گەیشـتن بەبەخـتەوەری و سـەرکەوتنی هەردوو دونیـا، ١٣ سەدە حوکمی ئیسلام باشترین بەڵگەی قسـەکانمانە، بـۆ زیـاتر ئاشنابوون بە گەنـدەڵکاری سیسـتەمی دیموکراسـی و بەرهەمەکـانی

دەتوانن سەیری فیلمی سینەمای "Blood Diamond" بکەن کە چۆن وڵاتانی ڕۆژئاوا ئەڵماسەکانی ئەفریقا دەدزن، بەڵام ئاگادار بە ئەوەی کە لەو فیلمەدا بوونی هەیە مشتێکە لە خەروارێک، بەڵکو زۆر لەوەیش خراپتر بەسەر نەوەکانی حامی کوڕی نوحدا دەهێنن کە ئەفریقیەکانن}.

**چوارەم// ئازادی تاکە کەسی**: لە ڕژێمی دیموکراسی دا ئازادی تاکەکەسی بریتییە لە ئازادی ڕەها و دەربازبوون لە هەموو کۆت و بەندێک، وە ئازادی هەڵوەشاندنەوەی هەموو بەهایەکی رۆحی و ڕەوشتی و مرۆڤایەتی، وە ئەم ئازادییە ڕێگە دەدات بە گەنجان و لاوان کە هەموو جۆرە کارێکی بێ ڕەوشتی ئەنجام بدەن لەبەرچاوی هەموو خەڵک، بەئاشکرا و بە نهێنی، وە ئازادی ئارەزووە سێکسیەکان، وە خواردنەوەی سەرخۆشکەرەکان، وە هەڵهاتنی گەنجان و لاوان لە سەرپەرشتیارەکانییان بە بیانوی ئازادی تاکە کەسی. ئەو ئازادییەی کە نەخۆشی ئایدز بەرهەم دەهێنێت ... بەڵام ئیسلام ئازادییەکان بە تێگەشتنی ڕۆژئاوا بە (حەرام) قەدەغەکراو دادەنێت و پێچەوانەی شەرعە وە ئازادی بە تێگەشتنی ئیسلامی بوونی نییە تەنها لە ئازادکردنی بەندایەتی دا نەبێت بۆ مرۆڤ کە بریتییە لەو ئازادکردنەی کە جارێکی تر نایەتەوە بوون، لەبەرئەوە لەکاتێکدا کە ناوی دەهێنرێت لەئێستادا

بەو مانـایە نـایەت جـگە لە ئـازادی ڕۆژئـاوا. وە مسـوڵمان شـانازی دەكات بە بەندایەتییەوە بۆ خودای مەزن، وە باشـترین سـیفەتە كە مسوڵمانی پێ دەناسرێتەوە، وە لە تەواوی بەنـدایەتی دا كە بەنـدە گـوێڕایەڵی پەرسـتراوەكەی دەكـات.{ كاتێـک مـرۆڤ بـووە بەنـدەی زاتــی ئیلاهــی ئیتــر نـابێتە بەنـدەی هـیچ مرۆڤێـک هـیچ پـارە و سـامانێكو شـەهاوەتێک، بەڵام كە ئەم مـرۆڤە بەنـدایەتی خـودای نەكـرد، تەنـانەت دەبێـتە بەنـدەی ئـاژەڵیش هەروەک چـۆن لە هیندستان بە ئاشكرا ئەم حەقیقەتە بە دی دەكرێت}.

**بەڵام هەڵوێستی ئیسلام لە بارەی ئازادییەكانەوە بریتییە لە:**

**یەكەم// ئـازادی بیـروڕا**: دروسـت نیـیە بـۆ مسـوڵمان ئـایینەكەی بگۆڕێت بـۆ ئـاینێكی تـر، پێغەمـبەر (د.خ) دەفەرموێـت (مـن بـدل دینە فاقتلوە)، واتە: هەر كەس ئـایینەكەی گـۆڕی لە ئیسـلامەمەوە بـۆ ئـاینێكی تـر بیكـوژن، جـا ئیتـر هەڵـگەڕاوەكە تـاک بێـت یـان كۆمەڵێـک بـن وەک یەک دەكـوژرێن.{ئەمەش لەبەر دووهۆكـار كە یەكێكیـان قـازانجی بـۆ كـوژراوەكەیە یەكێكـی ترییـان قـازانجی بـۆ كۆمەڵانی خەڵكە، هەرچی لە بـارەی خـودی كـوژراوەكەوەیە ئەوەیە كە ئەم كـوژراوە بە هەڵـگەڕانەوەی لە دیـن زیـاتر گوناهــ و تـاوان دەكات ئیدی بەم بەردەوامییە پتر ئازار و ئەشكەنجەی لە دۆزەخـدا بۆ زیاد دەبێت، هەر بۆیە كورد وەتەنی: زەرە لە نێوەیدا بگەڕێتەوە

قازانجه. هەرچی لە بارەی سودی کوشتنی لە هەڵگەڕاوەکەیە بۆ کۆمەڵگا ئەوەیە کە ئەم کوژراوە هەروەک چۆن خۆی گومڕا بووە، بە کوشتنی ئیدی گومانێک ناکرێت تا خەڵکی وەکو خۆی گومڕا بکات و پەڵکێشی سەرەڕۆیی و ئەشکەنجەی دۆزەخ بکات.

ئەگەر نیگایەک بۆ مێژوو بکەین دەبینین کە مەسیحی و جووەکان ئەگەر کارێکی نەشیاویان بەبێ هۆکار بەرامبەر پیرۆزییەکانی ئیسلام و شوێنکوتووانی نەکردایە ئەوا بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا و هەڵسوکەتی لەگەڵدا دەکرا و ڕێگەیان دەدرا بەئازادی نەریتە ئایینەیەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن، بۆ سەلماندی ئەم حەقیقەتە ڕۆژهەلاتناسی بەریتانی "تۆماس ئارنۆڵد" دەڵێت: "لەسەردەمەی دەوڵەتی ئیسلامیدا لە ئیسپانیادا هەریەکە لە مەسیحی و جوولەکەکان لە سایەیدا حەسابوونەوە و هیچ ناڕەزاییەکیان نەبووە. مەسیحیەکان کە ژمارەیەکی زۆر بوون هەموو جۆرە ئازادییەکی دینییان پێ بەخشرا بوو. هەرلەبەر ئەمە بوو هەندێکیان ناوێکی عەربییان لە منداڵەکانیان دەنا و خەتەنەیەنا دەکردن و دەبووە دراوسێی ماڵە موسڵمانەکان و بەشداری هەندێک لە ڕێورەسمەکانیان دەکردن و لە خواردن و خواردنەوەی یەکتریشیان دەخوارد".}.

**دووەم// ئـازادی بیروبۆچـوون:** ئـازادی بیـروڕا لە ئیسـلامدا پابەنـدە بە فەرمانە شەرعییەکانەوە، وەک:

**ئـ.** بۆچونێک کە وتنی قەدەغەکراوە، وەک: غەیبەت، قسـە هێنـان و قسە بردن، وە بوختان کردنی داوێن پاکان و هێرش کـردنە سـەر ئیسلام و تانەدان لێی.

**ب.** بۆچونێـک کە وتنـی فەرزە: وەک فەرمـان کـردن بە چـاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، وە لێپرسینەوەی فەرمانڕەوا.

**پ.** بۆچونێـک کە ڕێگەپێـدراوە، وەک: وتنـی وتەیەکـی چـاک یـان بێدەنگ بوون.

**سـێهەم// ئــازادی موڵکــدارێتی:** ئــازادی موڵکــدارێتی پابەنــدە بە شەرعەوە، دروست نییە بـۆ مـرۆڤ کە ببێـتە خـاوەن موڵـک بەهەر جۆرێـک کە بیەوێـت، وە هۆکـاری موڵکـدارێتی لە شـەرعدا دیـاری کـراون وەک کـارکردن: بەهەمـوو بەشـەکانییەوە وەک بازرگـانی و پیشەســـازی و کشـــتوکاڵ و خزمەتگـــوزاری، بۆمـــاوە (میرات)، وەسیەت، خەڵات و بەخشش.

**چوارەم// ئازادی تاکەکەسی:** ئیسـلام قەدەغەی کـردووە دەرچـوون لە (العقال) کە ناو دەبرێت بە ئازادی تاکە کەسی، مـرۆڤ ئـازاد نیـیە لەوەی کە خودی خـۆی ئـازار بـدات یـان بە خۆکوشـتن کۆتـایی بە ژیانی خۆی بهێنێت، یان نزیکی داوێن پیسی و نێربازی ببێـتەوە بە

بیانوی ئازادی تاكه كه‌سی، یان خۆی له به‌خێوكردنی باوك و دایكی په‌ك كه‌وته‌ی دووربخاته‌وه به بیانوی ئازادی تاكه كه‌سی، یان گه‌نجی كوڕ و كچی دڵدار له ماڵ ده‌ربچن پێكه‌وه به بیانوی ئازادی تاكه كه‌سی، وه ئیسلام ڕێگه ناداات به گه‌نج كه ده‌ستدرێژی بكاته سه‌ر كچێك له سه‌ر ڕێگه‌وبان یان هه‌ر جێگه‌یه‌كی تر، یان وته‌ی نه‌شیا و نه‌گونجاوی دژ به شكۆ و ڕێزی ئافره‌ت لێ ببیسترێت، یان پیاو ماچی ژنه‌كه‌ی بكات له‌به‌ر چاوی خه‌ڵك.{خوێنه‌ری به‌ڕێز، له ئیسلامدا به پێی شه‌رع ئازادی ده‌به‌خشرێت، نه‌ك به پێی بۆ چوونی مرۆڤه‌كان، ئه‌وه‌تا ڕۆژئاوا به‌ده‌ست دوو ده‌رده‌وه ده‌ناڵێنێت ئه‌ویش: سێكس و ئاژه‌وه‌گێری، هه‌ربۆیه ورده ورده سیسته‌می دیموكراسی به‌ره و تیاچوون ده‌چێت، چوونكه ئه‌م سیسته‌مه گه‌وهه‌رێكی نامێنێت كه گه‌نجی ده‌ست پاك و داوێن پاكه، هه‌ربۆیه ده‌یانه‌وێت به ناوی ئازادییه‌وه گه‌نجانی ئیسلام به چه‌شنی گه‌نجانی لایی خۆیان ببه‌ن، یان بانگه‌شه‌ی ئازادییه‌كی ڕه‌ها ده‌كه‌ن، هه‌روه‌ك چۆن ئێستا گروپیك له ئافره‌تان له ئۆكرانیا به ئاشكرا سه‌ر سینگیان ڕووت ده‌كه‌نه‌وه و تا چاوی ناپاك له جێگای به هاداری بڕوانێت، له كاتێكدا مێژووی مرۆڤایه‌تی به شیر سه‌ر سینگان گۆشه‌كرا و پیاوه مه‌زنه‌كانی

مێژوو پێی بە خێوکراوە، جا جێگایەک ئافرەت هێندەی خاوەن بەها بێت تاوان نییە ڕووت کرێت بۆ گەلە گورگی برسی؟}.

## "پوختە"

ئەم وشانەی رابردوو پوشێکە لەخەرمانێک لەو هەوڵانەی دەدرێن بۆ گەیاندن و روونکردنەوەی ئیسلام وەک فکرە و رێبازی ژیان بۆیە لەکۆتایدا ئەم چەندخاڵە دەخەینەڕوو:

١-نابێت ئیسلام بەپێوەری رۆژهەڵاتی یان رۆژئاوای بپێورێت، واتە: نابێت بەچاویلکەی کەسانێک تەماشای ئیسلام بکرێت کە دووربێت لەدونیای موسولمانان.

٢-هەر رێچکەیەک کە بەتێروانینی خۆمان بەباشی دەزانین یان لەچەند خاڵێکدا دژایەتی ئیسلامی نەکرد مانای ئەوەنییە کە ئەمە ڕێبازێکی راست و دروستە؛ چونکە دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت ئەو رێبازە چەندە باش بێت لەکۆتایدا بیروبۆچونی مرۆڤە.

٣-دەبێت موسوڵمانان بڕوایان وابێت کە ئیسلام چارەسەرە واتە تەنها چارەسەر بەس ئیسلامە.

٤-ئیسلام ئاینی دنیاودوارۆژە و لەهەمان کاتدا سیستەمی بەڕێوەبردن و فەرمان رەوایەتیە، پتر لە حەوسەد ئایەت باس لە حوکم دەکات، واتە باوەڕ نەبوون بەوەی کە ئیسلام ئاینی دەوڵەت و دنیاودوارۆژە ئەوە باوەڕنەبونە بەسەدان ئایەت.

٥-ئیسلام سەرچاوەکەی خوای پەروەردگار و قورئان و سونەتە بەڵام دیموکراسی سەرچاوەکەی مرۆڤەکان خۆیانن، واتە:دەکرێت لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر بگۆڕدرێت .

٦-لەدیموکراسیدا پێوەری کردەوەکان بریتییە لە:زۆرترین بەرژەوەندی کۆکردنەوە بەڵام لەئیسلامدا پێوەرەکان بریتین لە: حەڵاڵ و حەرام.

٧-دیموکراسی و شورا جیاوازن، دیموکراسی بریتیە لە:رێگەی فەرمانڕەوای بەڵام شورا بریتییە لەراوێژکردن بە کۆمەڵێکی دیاری کراو یان لەبابەتێکی دیاریکراودا.

٨-سیستەمی فەرمانڕەوایەتی ئیسلام پرۆژەیەکی تاقیکراوەیە کەبەسەرکەوتویی نموونەی خۆی پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد، بۆچی خۆمان بخەینە گرەوی سیستەمێکی دروست کراوی دەستی مرۆڤ.

٩-لەدیموکراسیدا فەرمانرەوایەتی بۆلایەنی زۆرینەیە، بەڵام لەئیسلامدا فەرمانڕەوایەتی بۆ شەرعە هەرچەندە کەمینەش لەسەر ئەو ڕایەبێت.

١٠-لەدیموکراسیدا پێناسەی دەسەڵاتی فەرمانرەوایەتی بریتیەلە: سەرۆکایەتی یان پاشایەتی. بەڵام لە ئیسلام بریتییە لە: سیستەمی

خـــیلافەت کە ئەویـــش بـــریتیە لە: ســـەرکردایەتی کردنـــی گشـــتی موسولمانان.

١١-لە دیموکراسیدا فەرمانڕەوا بە کرێ دەگیرێـت، بەڵام لەئیسـلامدا ئەگەر پـــارەیەکیش وەربگرێـــت لەبـــری ئەوکـــارەیە کە پێـــی هەڵدەستێت، واتە:ئەگەر خۆی خاوەنی بژێـوی بێـت دروسـت نیـیە هیچ پارەیەک وەربگرێت.

١٢-لەدیموکراسیدا سەرۆک ٤ یـان ٨ سـاڵ فەرمـانڕەوایەتی دەکـات بەڵام لە ئیسـلامدا تـا ئەوکـاتەی شـەرعی خـوا جێبەجـێ بکـات دەمێنێتەوە لە فەرمانڕەوایەتیدا.

١٣-لە دیموکراسیدا کۆمەڵگا دابەش دەبێت بـۆ دووبەش: دەسـەڵات و ئۆپۆزسـیۆن، بەڵام کۆمەڵگـای موسـوڵمانان لەگەڵ نـوێنەرانی ئومەت هەڵدەستن بەلێپرسینەوەی فەرمانڕەوا.

١٤-لەدیموکراسیدا دادگا مەدەنیە و لەئیسلامدا دادگا شەرعیە.

١٥-لەدیموکراســیدا سیاســەتی دەرەکــی لەســەربنەمای ڕێزگــرتن لەسنوری ئاوی و وشکانی دەوڵەتان و هەرێمەکانە بەڵام لەئیسلامدا لەسەربنەمای جیهاد و بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەبێت.

١٦-ئازادی لەدیموکراسیدا زۆربە ڕەهـایی بـاس کـراوە بەڵام ئـازادی لەئیسلامدا پابەندی فەرمانەکانی شەرع دەبێت.

ئەم چەند خاڵەی سەرەوە کـورتەی بیروڕاکـانی باسـکراوی دوتـوێی ئەم پەرتوکەیە .

## "کۆتایی"

**ئەی ئەو مرۆڤەی خودا ڕێزی لە ناویت:**

ئایا لات ڕوون بووەوە کە جیاوازی نێوان ئیسلام و دیموکراسی چییە؟! ئایا مسولمانێک هەیە دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە — بڵێت کە دیموکراسی لە ئیسلامدا هەیە ؟!

خودای گەورە ئیسلامی بۆ ناردوین نەک دیموکراسی، وە پابەندی کردوین بە ئیسلام نەک بە دیموکراسی، وە ئەوەی کە لێ پرسینەوەمان لەسەری دەکرێت ڕۆژی دوای ئیسلامە نەک دیموکراسی، خودای گەورە دەفەرموێت ( ان الدین عند الله الاسلام )، وە دەفەرمووێت ( ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه وهو فی الاخره من الخاسرین ). یان دەفەرموێت: (هذا بلاغ للناس ولینذروا به ولیعلموا انما هو اله واحد ولیذکر اولو الألباب ).

جا بێگومانیش تۆخۆت تاوانباربیت و بەرژەوەندیت لەمەترسیدا دابێت بێگومان بە جۆرێک یاسا و دەستور دەنوسێت کە لە بەرژەوەندی خۆی بێت، بەڵام کاتێک ئەو یاسا و دەستورەی لەلایەن خوداوەوە دابەزیوە جێ بەجێ کرا ئیدی گشت مرۆڤەکان لە بەردەم کێشەیەکدا وەکو یەکن، بە هیچ جۆرێک موجادەلە و واستەو واتەکاری نییە، هەروەک چۆن جارێکیان پەیامبەر (د.خ) فەرمانی خودای جێ بە جێ کرد لە بڕینی دەستی ژنێکی دز، ئەوەبوو هۆزەکەی هاتنە خزمەتی ڕەسول تا واستەی بۆ بکەن و

سـزاکەی سـوکتر بـکەن سـا بەڵکـو بەم جـۆرە نـاو و شـۆرەتی هۆزەکەیـان لە کەدار نەبێـت، بەڵام پەیـامبەر فەرمـووی: سـوێند بە خـودا، ئەگەر فـاتیمەی کچـی مـوحەمەد دزی بکـردایە، دەسـتم لە مەچەکیەوە دەبڕی.

ئـا لەمەوە بۆمـان دەردەکەوێـت کە مـرۆڤ خـودا بەدەسـتی خـۆی دروستیکردووە ناکرێت هەر ئەو زاتەش پەیامێکی وەک ڕێنـوێنی بـۆ ڕەوانە نەکـات بە پەیـامبەرانەوە تـا ببێـتە مـاییەی دادپەروەری بـۆ مرۆڤەکان و مافی هەموویان تێیدا پارێزراو بێت. با بپرسین: کاتێک ئامێرێکی ئەلکترۆنی دەکریت ئەگەر ئەو ئـامێرە کەتەلـۆکی لەگەڵـدا نەبێـت گومـان لەسـەر ئـامێرەکە درسـت دەکەیـن. یـان ئەگەر تـۆ پۆشاکێک بکریت ئەگەر ئەو پۆشاکە پارچە کاغەزێکی پێوە نەبێـت کە نیشانەی مارکەداریەتییەکەی بێـت، چـی دەگەیەنێـت؟ بێگومـان نیشانەی پرسیارت لادروست دەبێت. دەی باشیش بزانە، خـودا ئەم مـرۆڤەی کـردووە بە جێنشـین لەسـەر زەمینـدا ئەگەر پەڕتـووکێکی ئاسمانی لەگەڵدا نە نێرێت ئەوا وەکـو ئەو ئـامێرە ئەلکتـرۆنییە بـێ کەتەلۆکانە نیشانەی پرسیاری دەکەوێتە سـەری و لەوانەیە بوترێـت بێهـودە دروسـت کـراوە، بەڵکـو نیشـانەی بـێ نرخـی ئەم مـرۆڤە دەبێت، بەڵام خـودا خـۆی مرۆڤـی درسـتکردوو، هەر خۆشـی ڕێـزی لێنـا لەبەرئەوە ناکرێـت پەیـامێکی ئاسـمانی لەگەڵـدا نەنێرێـت کە

ببێتە مایەی بەرچاوو ڕۆشنی بۆیی، جا کاتێک ئەم مرۆڤە ئەم پایەمەی بۆ هات و فەرمانەکانی خستە کاییەی جێ بە جێ کردنەوە ئەوکات دەبێتە مرۆڤێکی خاوەن ڕێز، بەهۆیەوە دەبێتە هۆکاری خۆشگوزەرانی بۆ ئەو ناوچەیەی ئەو حوکمی لێدەکات، بەڵام لە نێوان پەڕتووکە ئاسمانییەکانەوە کە دابەزیوە هەر لەسەر دەمی حەزرەتی ئادەمەوە هەتا ئێستا تەنها قورئان پەیامێکی گشتگیر بووە و دەبێت وەک پەیامێک بۆ مرۆڤەکان لەلایەن خوداوە بۆ پێغەمبەر موحەمەدەوە (د.خ) دابەزییەوە، وە تەنها پەڕتووکە قورئانە کە لە سەرەتایی دابەزینییەوە تا ئەم ساتە یەک حەرفی گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە و پارێزراوە لەلایەن خوداوە؛ چونکە هەر خۆی بەڵێنی پاراستنی داوە لەدەستی بەرژەوەندی خوازی مرۆڤ.

جا ئێستا بڕیار بدە، ئایا ئامێرێک کەتەلۆک دارت دەوێت یان بێ کەتەلۆک؟ ئایا پەیامێکت دەوێت کە سەرچاوەکەی خودا بێت یان مرۆڤ؟

خودای مەزن لە قورئانەکەیدا پێمان ڕادەگەیێنێت کە پێویستە شوێنی پەیامەکەی بکەوین، { وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى

ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ٤٨ }[المائدة: ٤٨]،

واتە: " ئێمە ئەم قورئانەمان ناردە خوارەوە بۆ تۆ بە حەق و ڕاستی، کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ و پشتیوانییان لێ دەکات و چاودێریانە، **کەواتە حوکم و بڕیار بدە لە ناو نامەدارەکاندا بەوەی خوا ناردوویەتییە خوارەوە،** وە شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوە، لانەدەی لەو حوکم و بڕیارە هەق و ڕاستەی کە بۆت هاتووە و دامان ناوە، بۆ هەر ئوممەتێک لە ئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون، وە ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی دەکرد بەیەک ئوممەت و کۆمەڵ بەڵام (نەی کردوون) بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەو شەریعەت و یاسایانەی کە پێ ی بەخشیوون کەواتە پێشبڕکێ بکەن بۆ ئەو شتانەی کە چاکن گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خوایە بە گشتی ئینجا هەواڵتان پێ دەدا بەوەی کە لەجیهاندا جیاواز بوون تیایدا".

لەم باسەوە تێگەیشتین و بە لۆژیک بۆمان ڕوون بویەوە کە تەنها حوکمی ئیسلام توانای فەرمان کاری هەیە؛ چوونکە ئاسمانییەو وە قورئانەکەشی کە مەنهەجە هەرگیز دەستکاری نەکراوە لەلایەن مرۆڤەکانەوە، وەک: تەورات و ئینجیل و زەبور، هەربۆیە دەتوانین بڵێین، ئەگەر بۆ چاو بەس کردنیش بێت لە ڕۆژئاوا هیچ لایەنیک یان کەسایەتییەکی موسولمانان هەق نییە خۆی بە بانگخواز و تێکۆشەر بۆ ئیسلام بزانێت لە کاتێکدا کە باوەڕی بە دیموکراسی

هەبێتو لە پەیرە و بەرنامەی خۆیدا جێگای بکاتەوە، ئەمەش بە دوو بەڵــــگە دەســــەلمێنین کە یەکەمینییــــان ئەوەیە: لەگەڵ فەرمانەکانی خودادا موجادەلە کردن نییە، خۆ ئەگەر موجادەلە بکەیت خودا پشتت دەدات بە زەمیندا.

بەڵگەی دووەمیش ئەوەیە: کە تەنها خودا سەرکەوتن دەبەخشێت نەک موســڵمانان و کــافر، وە نەک یارمەتییەکــانی ڕۆژئــاوا بــۆ لایەنێکی ئیسلامی کە بانگەشەی دیموکراسی بکات، هەروەک لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە: { إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ}، کە دەیسەلمێنیت تەنها و تەنها خودا سەرکەوتن دەبەخشێت جا تۆ بانگەشەی دیموکراسی بکەیت یان نا، ئەگەر دەشڵێیت کە پێوستە هۆکار بگرینە بەر تا خوداش سەرکەوتن ببەخشێت ئەوا ئەو ڕێگــایەی کە پێغەمــبەر(د.خ) گــرتییە بەر کە پەروەردەکردنــی هاوەڵان بوو باشترین هۆکارە.

{وصلى الله وسلم على سيدنا وقائدنا ونبينا محمد وعلى اله وصحبه وسلم}

# پێرست


پێشەکی........................................٦
جیاوازی نێوان ئیسلام و دیموکراسی..........................٩
١. لەڕووی بنچینەوە..................................١١
٢. بیر و فەرمان و یاساکان............................١٤
٣. بەختەوەری.......................................١٦
٤. پێوەری کردەوەکان..................................٢٠
٥. دیموکراسی و شورا (ڕاوێژ)............................٢١
٦. ڕێساکانی فەرمانڕەوایی..............................٢٣
٧. زۆرینە و کەمینە...................................٢٣
٨. شێوازی فەرمانڕەوای.................................٢٥
٩. (جهاز الحكم) دەزگای فەرمانڕەوای.......................٢٧
١٠. هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا...............................٢٩
١١. هەڵگەڕانەوە و سەرپێچی کردن.........................٣١
١٢. نەیاری (المعارضة) و لێ پێچینەوە........................٣٢
١٣. دادگا............................................٣٢
١٤. پێکهێنانی حیزبەکان..................................٣٣
١٥. سیاسەتی دەرەوە...................................٣٣
١٦. سنور.............................................٣٧
١٧. نەتەوە و هۆزەکان..................................٣٨
١٨. ئازادییەکان.......................................٣٩
پوختە.............................................٥٥
کۆتایی............................................٥٩

# التعارض بين الأسلام و الديموقراطية

The Difference Between Islam & Democratic







چاپخانەی سیما